# بڕیار

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

92

ساڵی هەشتەم
شوباتی ٢٠١٦

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی






با، تێر
ئاگای لە برسی بێت!

بەڵای زوبان!

ئەم زستانە!

گەورەترین مرۆڤ!

چۆن خۆمان لە تەممەڵی بەردەوام ڕزگار بکەین؟

فەرامۆشکردنی مرۆڤ!!

تەنیایی!

RASAN
Group



لەو ڕۆژەوە، کە بنیاتنانی
مرۆڤمان فەرامۆش کرد،
بڕبڕەی پشتی وڵاتو
دەوڵەتمان شکاند.

د. عادل شێخانی

خاوەنی ئیمتیاز

ئەندازیار:

مەسعوود تـاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین

بەرزان ئەبوبەکر

دەستەی نووسەران

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فــارس

زاهیــــر زانــــا

گوڵان حەمەئەمین

محەممەد مێرگەیی

محەممــەد هاشــم

وەهــاب حەسـیب

یەحیــا محەممەد

No: 92

شوبات

2016

ڕاوێژکاری یاسایی

پارێزەر: ئازاد محێدین

بەشی هونەریو دیزاین

جمال دەروێش

پشتیوان عبدالرحمن

تایپ

کەلسوم جەلال

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی: شەقامی سالم -

تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی چوارەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر: ٠٧٥٠٠٥٢٥٣٠٣٥ - ٠٧٥٠٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazine

bryarmagazin@gmail.com

چاپ: پیرەمێرد

دابەشکردن: پەیك/ 07708649210

نرخ: 2500 دینار



# با، تێر

## ئاگای لە برسی بێت!

هەرچەنـدە دەگوترێـت: تێـر، ئاگای لە برسـی نییەو مرۆڤی تێرو پۆشتەو پەرداخ، ئاگای لە ناڵەی هەژارو دەردی بێنەواو کزەی دڵی برسیو دەستکورتەکان نییە، بەڵام ئەمە کاتێکە، کە مرۆڤ، مرۆڤبوونی خۆی لەیاد دەکاتو هەستو شعووری لەکار دەکەون!

چونکە گەر مرۆڤ، لە مرۆڤایەتیی خۆی نەشۆرابێتەوە، چۆن دەتوانێت، لە ئێشو ئازاری مرۆڤەکان بێئاگا بێت. چی تامو لەزەتێك لە ژیانو خۆشییەکاندا هەن، کاتێك خوشكو براکانم لە برسا هاوار بکەنو لە هەژاریدا بناڵێنن!؟

چی شـانازییەکە بۆ من، خاوەنی پارەی مۆڵو کۆشـكو تـەلاری بەرزو ئۆتۆمبێلی گرانبەهـا بم، کە هاونەتەوەکانم پارەی دەرمانی نەخۆشو شیری منداڵی ساوایان پێ نەبێت؟!

چ هەسـتێکی مردووە، کە ئێواران لەسەر سفرەو خوانی ڕازاوە دابنیشـمو منداڵانی بێباوکی وڵاتەکەم، لە سەرماو لە برسا هەڵبلەرزێن؟!

ئەو کاتەی منداڵانی وڵاتەکەم، بێپەرتووكو بێپێنووسو بێقوتابخانـەو بێدەرمانو بێچاودێـریو بێخۆراكو بێمافن!

ئیدی من شانازی بە چییەوە بکەم!

ئـەو کاتـەی ئافرەتانی وڵاتەکەم، هەر ڕەشـپۆشو هەر خەمبارو هەر بێکەسو هەر بێنەوان!

منیـش نەمتوانـی لەبـری بـراو هاوسـەرو کـوڕە شـەهیدەکانیان، خەندەیەکیـان پـێ ببەخشـم، ئیدی من ناسنامەی چ نەتەوەیەکم هەڵگرتووە؟!

لـە دوای تەمەنێك لە شـۆڕشو قوربانیـدان، ئەگەر لە پەرێزی کوردایەتیدا، گوڵێك نەبم، ئیدی بۆ دەبێت بە خۆم بڵێم کورد، کە نەتوانم بە خۆم بڵێم مرۆڤ!!

دەبا مرۆڤەکان، هەر مرۆڤ بن، پارێزگاری لە گەورەترین سەرمایە بکەن لە فەوتانو لەناوچوون!

با پاشماوەی مرۆڤ، لە وڵاتەکەماندا بمێنێت، با سۆزو بەزەییو میهرەبانی کۆچ نەکاتو وڵاتەکەم جێ نەهێڵێت!

دڵنیا بن ئەگەر لێرەش بە یەکتری نەگەینو دەرگاکان بـە ڕووی یەکتردا دابخەین؛ ئەوا هەمووومان لە کووچەو کۆڵانی گۆڕسـتانەکانی شـاردا، بە یەکتر دەگەین، بەڵام پاش چی!!؟؟

# کارگێری بە گوفتار

هەرکەس لە پێناوی سەرکەوتنیدا، هەموو شتێکی بەختکرد؛
هەموو شتێکیش دەدۆڕێنێت.

پەندێکی ئەمریکی

چوار ڕێگە هەن، کات بە فیڕۆ دەدەن:
بەتاڵی، فەرامۆشکردن، خراپ کارکردن، کارکردن لە ناکاتدا.

ڤۆڵتێر

ئەو کەسەی لە منداڵیدا فێر نەبێت؛
لە گەورەییدا پێش ناکەوێت!

پەندێکی عەرەبی

شوانی ناپاك، لە گورگ خراپترە.

پەندێکی کوردی

کارکردن، مرۆڤ لە سێ زیان دووردەخاتەوە:
کرداری ناشیرین، بێزاری، پێویستی.

ڤۆڵتێر

کاتێك چینییەکان، هەستیان بە دڕندەیی هێرشەکانی بەربەرییە باکورییەکان کرد بۆ سەر وڵاتەکەیان، بۆئەوەی وڵاتەکەیان بپارێزن ، لە هەموو هێرشو مەترسییەك، بڕیاری درووستکردنی دیوارێکی بەرزو بڵندو بە هێزیان دا؛ وەك پشتێنەیەکی هێمنیو پاراستن، لەو پێناوەدا، هەموو توانای خۆیان خستە گەڕ؛ تا دیوارێکی بەهێزو پۆڵاینیان درووست کرد!

دوابەدوای ئەوە، پاش چەندین ساڵ بەربەرییەکان هەوڵی شکاندنی ئەو پشتێنە بەهێزەیان دا، بەڵام هیچیان بۆ نەکرا، بۆ ئەم مەبەستەش زۆر بیریان کردەوە، تا لە کۆتاییدا گەیشتنە بیرۆکەی بەرتیلدان بە دەرگاوانەکانی شوورای چین!

بەو شێوەیە سەرکەوتنیان بەدەست هێناو توانیان چین داگیربکەن!

ئەم ڕووداوەش لە مێژووی چیندا، چەندین جار دووبارە بووەوە!

# فەرامۆشکردنی مرۆڤ!!

لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:

١- چین زۆر خۆی ماندوو کرد؛ بۆ درووستکردنی دیواری پۆڵایین، بەڵام بنیاتنانی مرۆڤی فەرامۆش کرد، لەبەرئەوە هیچ سوودێکی نەبوو!

٢- ئەوەی وڵات دەپارێزێت، دیواری پۆڵایینو لەشکرو سوپای پڕچەك نییە! بەڵکو مرۆڤی دڵسۆزو دەستپاكو نیشتمانپەروەرە!

٣- قەڵای ئەخلاقی بەرز، بە هیچ لەشکرێك ناشکێتو هەرگیز ملکەچ نابێت!

٤- هەر کاتێك قەڵاکانمان لە ناوەوە هەڕەشەیان لەسەربوو، خۆرەی ناوەکی تێدابوو! ئیدی دەرگاکانی دەخرێتە سەر پشت بۆ دوژمن!

٥- وڵات بە مرۆڤ ئاوەدان دەکرێتەوە، هەر وڵاتێك خاڵی بوو لە مرۆڤ؛ با هەموو سەروەتو سامانی دونیاشی هەبێت، هەژارو داماوو سەرگەردانە.

٦- چینییەکان نەیانزانی، ئەو کاتەی کەلێن دەکەوێتە دیواری ڕەوشتو بەها بەرزەکانەوە، ئیدی هەموو دیوارە بەهێزەکان هەرەس دەهێنن!!

٧- ئێمە ناتوانین پشت بە دیواری بەهێزو شوورای بڵندو سەروەتو سامان ببەستینو بەئارامی شەوانە بنوین! کاتێك نەمانتوانیوە ئەو مرۆڤانە درووست بکەین، کە ئابووریو ئاسایشی خۆمانیان تەسلیم بکەین!



# تەنها بۆ سەرکردەکان

ستەمکردن لە سرووشتی مرۆڤە، تەنها دوو هۆکار دەتوانێت ڕێی لێ بگرێت:، یان هۆکارێکی ئاینی، لەترسی ڕۆژی دوایی، یان هۆکارێکی سیاسی، لە ترسی شمشێر!

ئەرستۆ

**بترسن لە سزای ستەملێکراو؛ چونکە لە نێوان نزای ستەملێکراوو گیرابوونی نزاکەی لای خودا، هیچ پەردەیەک نییە!**

پێشەوای مرۆڤایەتی (ﷺ)

خراپترین توێشوو بۆ ڕۆژیی دوایی، ستەمکردنە لە مرۆڤ!

ولی الدین

ستەمکار، هەمیشە پەشیمانە، ئەگەرچی خەڵکیش وەسفی بکەن، بەڵام ستەملێکراو سەلامەتە، ئەگەرچی خەڵکیش سەرزەنشتی بکەن. مرۆڤی قانع دەوڵەمەندە، ئەگەر چی هەژاریش بێت، مرۆڤی چاوبرسیش هەژارە، ئەگەرچی پاشاش بێت!

حارس کوڕی ئەشەدی محاسبی

دووجۆر مرۆڤ ئەگەر چاکبوون، هەموو خەڵکی چاک دەبن، ئەگەر خراپیش بوون؛ ئەوا هەموو خەڵکی خراپ دەبن، ئەوانیش (زاناکانو کاربەدەستەکانن)!

پێشەوای مرۆڤایەتی (ﷺ)

# بەڕێوەبەر، کاتی خۆی چۆن بەسەر دەبات؟



### ئاگات لە تۆمارو نووسراوە وردەکان بێتو بیانپارێزە

دوو جۆر کەس هەن: یەکەمیان ڕقو قینی لە کاغەزکاریو ڕۆتین دەبێتەوە.
دووەمیشیان لە نووسراوو کاغەزو کاغەزکاری، خۆشیی دێت.

بەڕێوەبەری باشیش، باش تێ دەگات، لەم دووانە کامەیانە، پاشان هەوڵی درووستکردنو ڕاگیرکردنی هاوسەنگیی نێوان کەسێتیی خۆیو پێداویستییە ڕاستەقینەکانی کار دەدات.

گەر ڕقت لە زۆریی نووسراوو کاغەزو کاغەزکاری دەبوویەوە؛ دەتوانیت پێداچوونەوەیان، بە کەسێکی جێمتمانەی خۆت بسپێریت.

ئەوەی لێرەدا، پێویستە لەسەرت ئەنجامی بدەیت، پەیداکردنی کەسێکی شەیداو خۆشحاڵە بە پێدچوونەوەی گوزارشتەکان «ڕاپۆرتەکان»و پاراستنو هەڵگرتنی تۆمارەکان؛ تا لەبری تۆ، ئەو ئەرکە ئەنجام بدات. هەروەها پێویستە لەسەرت، سەرپەرشتیی کارەکە بکەیت، هەمیشە بەسەر ئەو شتانەی لە دەوروبەرتدا ڕوو دەدەن، ئاگادار بیت. بەمە دەتوانیت کاتێکی زۆر -کە ئەم کارە پێویستییەتی - بگەڕێنیتەوە، تواناشت دەبێت، درێژە بە هەڵگرتنو دەسخستنی زانیارییە پێویستەکان، بۆ بەڕێوەبەرەکەت، یان بۆ ئەو کەسەی جێت دەگرێتەوە، بدەیت.

ئەگەر حەزیشت لە کاغەزکاری بوو، چاکتر وایە، خۆت لەسەر کەمکردنەوەی ئەو کاتەی لە خوێندنەوەو نووسینی گوزارشتەکاندا بەسەری دەبەیت، ڕابهێنیت.

پێویستیشە بەشێك لە وەختی ڕۆژانەت دابڕیو تەرخانی بکەیت، تا دوور لە نووسینگە، یان شوێنکارەکەت بیبەیتە سەر. واتە: لەناو جەرگەی کارمەندەکانداو پێگە سەرەکییەکانی خۆیاندا.

### هاوسەنگیکردن لەنێوان بەرپرسیارێتییەکاندا

ئاشکراو دیارە، کە دەبێت لە یەك کاتدا، وەك ئەو یاریزانە سێرکەی چەندان تۆپ، لە هەوادا دەهێڵێتەوە، ژمارەیەکی زۆر لە تۆپەکان لە هەوادا بهێڵیتەوە.

بەواتایەکی دیکە: ئەرکی سەرشانتە، یەکسانیو سەربەسەری لەنێوان زۆرێك لە کاروبارەکاندا، بەدی بهێنیت. کورد گوتەنی: نەشیش بسووتێت، نە کەباب.

### پێویستە هاوسەنگی بکەیت لە نێوان:

١. پێداویستیی کۆمپانیاو پێداویستیی ئیشکەرو کرێکارو کارمەندەکان.

٢. خواستی خێرا ڕاپەڕاندنو پێویستیی بەسەربردنی برێك وەخت لە ڕاهێنانی کارمەندەکاندا.

٣. پێویستێتیی هێشتنەوەی ماوەو مەودایەك لە نێوان خۆتو کارمەندەکاندا، هەروەها پێویستێتیی ئەوەی لێیان نزیك بیتو لەگەڵیاندا هاوخەمو هاوسۆز بیت.

٤. داواکاریی کارو هەندێك خواستی ئەو کەسانەی بەڕێوەیان دەبەیت.

لێرەدا کەسێك شك نابەیت، بڵێ: بەدیهێنانی ئەم هەموو هاوسەنگییە، کارێکی ئاسانەو ماڵی بێدانە.




# کاری کەمو ئەنجامی مەزن

## ٥٠ ئامۆژگاری بۆ دەستکەوتی گەورە

ن: عبدالله العثمان و: جەلال عەبدوڵڵا

### ٢١- پەشیمانبوونەوەی خێراو گفتوگۆ بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵە..

کاتێك هەڵە دەکەیت، پەلە بکە لە پەشیمانبوونەوە، کاتێك هەستی کەسێك بریندار دەکەیت، پەلە بکە لە داوای لێبووردن، کاتێك هەست بەبێورەیی دەکەیت هەوڵ بدە خۆت خۆشحاڵ بکەیت، کاتێك هەست بە مەترسی دەکەیت، بە وریایی خۆت پڕچەك بکە، کاتێك شتێکت پێ دەبەخشن، بەجوانی وەڵامی بدەرەوە، کاتێك ورەت بەرز دەبێتەوە، هەوڵی دەستکەوتی زیاتر بدە، هەرچەندە هەڵە دوا بخەیتو هەڵە لەسەر هەڵە زیاتر دەبێت، ژەنگ لەسەر ژەنگ کۆ دەبێتەوەو تاریکی لەسەر تاریکی، گڕی مۆمەکەت کوژاندەوە، ڕۆشناییەکەت نامێنێت، هەرکاتێك مۆمەکەت کوژایەوە؛ یەکسەر دای بگیرسێنەرەوە، ڕازی مەبە لە تاریکیدا بژیت، بەڵکو بەردەوام لەناو ڕووناکیدا بە.

### ٢٢- دکتۆرا لە نێو ئۆتۆمبێلدا!

ئەگەر لەناو ئۆتۆمبێلدا ڕۆژانە گوێ لە کاسێتێك بگریت؛ ئەوا تۆ گوێ لە(٣٦٥٠) دانە دەگریت لەماوەی ١٠ ساڵدا، کە بەرامبەرە بەوەرگرتنی نامەی دکتۆرایەك. چەند پاداشتو زانستمان لەدەست دەچێت، لەو کاتەی کە لەنێو ئۆتۆمبێلداین، کاتەکان لەدەستمان دەچن بە قسە، گوێگرتن لە مۆسیقاو تووڕەبوون لە خەڵکی سەرشەقام، ئەم بیرۆکەیە شیاوی پیادەکردنە؛ چونکە زانست وەردەگرینو ڕێنموونیو ڕووناکییەو کاتمان بۆ زیاد دەکات.

### ٢٣- وشەی پەسەندو جوان بەکار بهێنە.

کۆمەڵێك وشە هەن، وەك سوپاست دەکەم، ئەگەر ڕێگەم بدەیت، ئەگەر بەڕێزتان، خودا پاداشتی خێرتان بداتەوە، خودای گەورە دەرووی خێرتان لێ بکاتەوە، خودا قوەتتان بدات، بارەکەڵڵا، خودای گەورە بۆ کاری خێر بەکارتان بهێنێت، خۆشی دەخەنە دڵی خەڵکەوە، سۆزی خەڵك بەلای خۆتاندا ڕادەکێشن، وشەی کورتو سادەن، بۆ وتن ئاسانن. کاتێك دڵی خەڵکی پڕ دەبێت لە حەسوودیو چاوچنۆکی، ئەوکاتە پێداهەڵدان کەم دەبێتەوەو ڕەخنەگرتن زۆر دەبێت، جیاوازی بەربڵاو دەبێت، سۆزو خۆشەویستی کەم دەبێتەوە، تۆ دەبێت دەسپێشخەری بکەیت، بۆ چاککردنی ئەم جیهانە.

بەم وشانە سۆزی خەڵکی بەدەست دەهێنیت، ئەوەی دەتەوێت پێی دەگەیت، هەرچەند زیاتر ببەخشیت زیاتر وەردەگریت.

### ٢٤- دوودڵی.

دوودڵی کات بەفیڕۆ دەدات، کاتێك بیر لە شتێك دەکەیتەوە، خۆت یەکلایی بکەرەوە، یان بە قەبوولکردنی، یان ڕەتکردنەوەی، یان دواخستنی، کاتێك دوودڵ دەبیت لە بڕیارداندا، مێشکت دەستەوسان دەبێت، چی بکات! نازانێت بەرەو کوێ دەڕوات، دوودڵی کاتو توانایەکی زۆر بەفیڕۆ دەدات، کاتی خۆتو ئەو کەسەی لەگەڵتدایە بەهەدەر دەچێت؛ چونکە نازانن بڕیاری تۆ چییە، بڕیاردانو پاشان هەڵەکردن، زۆر باشترە لە بڕیارنەدان، کاتێك هەڵە دەکەیت، شتێکی نوێ فێر دەبیت، لە کاتێکدا هیچ کارێك نەکەیت؛ ئەوا هیچ فێر نابیت، بڕیارنەدان خۆی بۆخۆی بڕیاردانە.

### ٢٥- لە ئەمڕۆ بەدواوە خەو نییە.

هەندێك کەس ڕۆژانە (١٠) کاتژمێر، یان زیاتر دەخەون، ئەمە بەفیڕۆدانی کاتە، لەکاتێکدا کاتژمێرەکانی خەوتن کەم دەبێتەوە؛ ئەوا تۆ کاتێکی زۆرترت دەست دەکەوێت، دەتوانی سوودی لێ وەربگریت بۆ دەستکەوتی گەورەو خوداپەرستی، بەتایبەتی ئەو کەسانەی بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەستن، سوود لەکاتێکی زۆرتر وەردەگرن، پێش هەموان بێ شڵەژانو پەلەپەلکردن، بەهێمنی دەست بەکارەکانی دەکات. خەوێکی کەم بەسە بۆ مرۆڤ، پێویست بەم ماوە زۆرەی خەو ناکات، مرۆڤ کاری لەپێشەو ڕاسپێردراوە بۆ ئاوەدانکردنەوی زەوی، کاتی زۆری نییە بۆ خەو.



# پلان

## کۆدی خێزانیو کۆدی تایبەت

سامان کەریم
بەشی شەشەم

دەگەڕێینەوە سەر خشتەی سەرەکیو چەند بەشێکی تر زیاد دەکەین بۆ خشتەکەمان:

| | خەڵکی کوێن لە ئەسڵدا | خانووی خۆتە، یان کرێچیت |
|---|---|---|
| + | | |

**خەڵکی کوێن لەئەسڵدا:** مەبەستی سەرەکیمان لەم بەشە، بۆ پلانی ئاوەدانکردنەوەی لادێکانە، بەشێوەیەکی زانستی، ئەویش بەم ڕێگایە دەکرێت، بەوەی هەر خێزانێك خەڵکی چ قەزایەك، یان ناحیەیەك، یان لادێیەك بێت بۆ کاتی ئاوەدەنکردنەوە، سوود لەم بەشە وەردەگرین؛ بۆئەوەی کاتێك سنووری ناوچەکان دیاری دەکرێت، بزانین چەند خێزان لەو ناوچانەدا بوونیان هەیە؟ چونکە سنووری قەزاو ناحیەو لادێ دیاری کراوە. واتە: ئەو زەوییەی کە هەر ناوچەیەکی نیشتەجێبوون هەیەتی، هەر هێندەیە، بەڵام ژمارەی دانیشتوان، بەردەوام زیاد دەکات، بۆیە دەبێت ڕەچاوی خاڵێکی گرنگ بکەین، کە قەزاو ناحیەو گوند، نابێت بکرێن بە شار، مەبەستمان لەم وتەیە ئەوەیە، کە نابێت زەویی کشتوکاڵی، بۆ نیشتەجێبوون بەکار بهێنین! وەك چۆن ئێستا، لادێ سیمای لادێی لەدەست داوە، بۆیە پلانی ئاوەدانکردنەوەی لادێکان بەشێوەیەك ئەنجام دەدەین، کە خەڵکی شاریش حەز بە ژیانی لادێ بکات لە هەموو ڕووەکانەوە. دیارە بە خزمەتگوزاریی تەواوەو حساباتی وردی هەموو شتێك دەکرێت؛ بۆئەوەی ئەو کۆچەی کە لە ناوچەکانی دەرەوەی شار بۆ ناوشار کرا، لەبەر چەندین هۆکار. لەم ڕێگایەوە بەهۆی وەرگرتنی ئاماری زانستی، کار بۆ پێچەوانەکردنەوەی حاڵەتەکە بکەین، کە چەندین سوودی زۆری دەبێت، لەوانە: قەرەباڵغی ناوشارەکان نامێنێت، کێشەی هاتوچۆ کەم دەبێتەوە، ژینگە پاك دەبێتەوە، تەندرووستی بەهۆی خراپیی ژینگەوە، دەگەڕێتەوە بارێکی زۆر باش. واتە: زانینی ئەم بەشەو کارکردن بۆی، زۆر کێشەمان لەکۆڵ دەکاتەوە، کە لەپلانی ئاوەدانکردنەوەدا جوانتر ئاماژەی پێ دەکەین، کە چۆن کاری ئاوەدانکردنەوە ئەنجام بدەین.

**خانووی خۆتە، یان کرێچی:** کێشە گەورەکەی کورد، بریتییە لەم خاڵە، لەڕێی ئەم پلانەوە، دەتوانین ڕێژەی خاوەن خانوو، کرێچی بزانین، دەشزانین ڕێژەکە بەپێی دانیشتوانی گشتی هەر پارێزگایەكو ناوەندو قەزایەك چۆن دابەش بووە، بەپێی ناوچەکانیش چۆن دابەشبوون؛ چونکە لەڕێی ئەم پلانەوە، ئامارەکە دەزانین. بەپلانی ئاوەدانکردنەوەش کۆتایی پێ دەهێنین. ئەویش بەچەند میکانیزمێکی گرنگ، کە بەم شێوازەی ئێستا، ئەم کێشەیە لەسەر هاوڵاتی قورستر کراوە؛ تاکو چارەسەر بکرێت؛ چونکە چەندین کۆمپانیا بێ لێپرسینەوە، هێندەی بازرگانییان بە ژیانی هاوڵاتی فەقیرەوە کردووە، هێندە خزمەتیان بەچارەسەرکردنی کێشەکە نەکردووە. لەبەرئەوەی زۆرینەی کۆمپانیاکان، لەبەر سوودی خۆیان، خەیاڵیان لای ویژدانیان نییە. دیارە ئەمەش لەڕێی حکومەتو حیزبەوە ئەم کارەیان پێ کراوە. وەك ئەوەی کە ئێستا دەیبینین لە شوێنێك، یان لە ناوچەیەك، چەند یەکەیەکی نیشتەجێبوون دروست دەکرێن، بێئەوەی چارەسەری کێشەکەی پێ بکرێت؛ چونکە لە ئەسڵدا نازانرێت چەند خێزان کرێچین. هەروەها لەکاتی دابەشکردنی فۆڕمدا، دەبێت بە چ فەوزایەك لە کاتێکدا هیچ پێویست بەوە ناکات، گەر ئەم پلانەمان هەبێت؛ لەبەرئەوەی بەپێی شوێنی نیشتەجێبوون، لەهەر ناوچەیەکدا، دەزانین چەند کرێنشین هەیەو بەپێی ئەو ژمارەیە، یەکەی نیشتەجێبوون دروست دەکرێت، نەك خەڵك بانگ بکرێت، بۆ وەرگرتنی فۆڕمو کارتو چارەسەری کێشەکەش ناکرێت.

**گرنگیی زانینی خانووی خۆت، یان کرێ..**

لەم چەند خاڵەدا، گرنگیی ئەم بەشە ڕوون دەکەینەوە:

**یەکەم:** دەبینە خاوەنی ئامارێکی ڕاست، لەسەر ژمارەی ئەو خێزانانەی کە کرێچین، یان خاوەنی خانووی خۆیانن.

**دووەم:** بەپێی ئامارەکە، دەتوانین بە پلانی ئاوەدانکردنەوە، دەست بکەین بەچارەسەرکردنی کێشەکە لەیەك کاتدا بۆ هەموو ناوچەکان، نەك ناوچەیەك بەهەرەمەکی، چەند یەکەیەك بکرێتو کەس نەزانێت، کێ لێی سوود مەند دەبێتو بۆ کێ دەبێت.

**سێیەم:** لەم ڕێگایەوە؛ چونکە ئاماری کرێچیمان دەبێت، هەر کات یەکەکانی نیشتەجێبوون تەواو بوون، خۆت بانگی کرێچییەکان دەکەیتو یەکەکانیان پێ دەدەیت، نەك خەڵك بخەیتە مەینەتەوە بەو هۆسەو فەرتەنەی کە دەبێت بەشەڕ لەسەر وەرگرتنی فۆڕم کە بەڕاستی جێی نیگەرانییە. واتە: کاتێك لە هەر ناوچەیەکی پارێزگاکاندا، بەپێی ئەم پلانە، زانیمان چەند خێزانی کرێنشین هەیە، هێندە یەکەی نیشتەجێبوون بۆ

ئەو خێزانانە درووست دەکەین.

دەشـــتوانین بۆئـــەوەی ڕێگری لـــە ســـاختەکاری بکەین، ئەو یەکانە لەڕووی یاساییەوە کڕینو فرۆشتنی قەدەغە بکرێت، بەڵام بەڕاستی قەدەغە بکرێت! هەروەها ئەو خێزانە خۆشی نیشتەجێی ئـــەو یەکەیە بێت، نەك خۆی لەخانووی خۆیدا بێتو یەکەکەش بـــدات بەکرێ، هەروەها گەر دەرکەوت، هەرکەس خانووی هەیەو خۆی بەکرێچی نووسیوە، سزایەکی وەها بدرێت کە ببێتە نموونە بۆ هەموو کەسێکو لەڕاگەیاندنی بیستراوو بینراودا باس بکرێت؛ بۆئەوەی هیچ کەس نەوێرێت، ئەم کارە بکات، ئەمەش دەتوانرێت ڕێگـــری لێ بکرێت، گەر لایەنـــی پەیوەندیدار بیەوێتو گەندەڵی قەبووڵ نەکرێت.

دەگەڕێینەوە سەر خشتەی سەرەکیو چەند بەشێکی تر زیاد دەکەین بۆ خشتەکەمان:

| | ئوتومبیلت هەیە | باری تەندرووستی | بڕوانامە | پسپۆڕی |
|---|---|---|---|---|
| + | | | | |

ئۆتۆمبێلـــت هەیە: وەڵامی ئەم پرســـیارە بەشـــێوەی بەڵێو نەخێر، دەبێت تەنها بۆ زانینی ژمارەی ڕاســـتەقینەی ئۆتۆمبێلی هاوڵاتیـــان لە هەر پارێزگاو ناوچەیەکی نیشـــتەجێبووندا، واتە: ڕێژەکەی بەپێی ژمارەی دانیشتوان، بەشێکی ئەم پلانەش تایبەت دەکەیـــن، بە پلانی هاتوچۆوە کە پلانێکـــی گەورەی هاتوچۆمان دەبێت لەهەمـــوو ڕووەکانەوە؛ بۆئەوەی بزانیـــن بەپێی ڕووبەری ناوچـــەی نیشـــتەجێبوون چەنـــد ئۆتۆمبێل هەیە کـــە بۆ پلانی هاتوچۆ سوودێکی زۆری دەبێت.

بـــاری تەندرووســـتی: ئـــەم بەشـــە تایبەتـــە بەزانینی باری تەندرووســـتیی هـــەر هاوڵاتییـــەك لـــە ڕووی نەخۆشـــییە درێژ خایەنـــەکانو حاڵەتەکانـــی کەمئەندامـــیو نەخۆشـــیی زگماکی؛ بۆئـــەوەی لەڕێـــی ئەم پلانـــەوە، ئامـــاری ڕاســـتەقینەی جۆری نەخۆشـــییەکان بەپێی شـــوێنی نیشـــتەجێبوون بزانینو لەڕێی پلانی تەندرووستییەوە لە داهاتوودا چارەسەری پێویستی هەموو ئەو نەخۆشییانە بکەین کە بوونیان هەیە.

بڕوانامە: ئەم بەشـــە پەیوەســـتە بە بەشی بڕوانامەوە، واتە: بڕوانامەی هەر کەسـێك لە نەخوێنـــدەوارەوە دەیگرێتەوە، تاکو بەرزتریـــن بڕوانامە، کە لەڕێی ئەم پلانەوە، لە هەر ناوچەیەکی نیشـــتەجێبووندا، ڕێژەی بڕوانامەکانی پـــێ دەردەکەین، ئەمەش زۆر گرنگـــە بۆ چەنـــد لایەنێك، لەوانە: ڕێـــژەی نەخوێندەواری پێ دیاری دەکەین، لەهەر ناوچەیەکی نیشـــتەجێبووونداو بنەبڕی نەخوێندەواری پێ دەکەین.

پسپۆڕی: لەڕێگەی ئەم بەشەوە، پسپۆڕیی بڕوانامە بەرزەکان دیـــاری دەکەین لە چ بوارێکدایە، واتە: بەپێی ناوچەکان دەزانین بۆ هەر بوارێك، پسپۆڕییەکان چۆن دابەشبوونو هەر ناوچەیەك پێویستی بە چ پسپۆڕییەکە.

گرنگیی بڕوانامەو پسپۆڕی، لەم چەند خاڵەدا ڕوون دەکەینەوە:

یەکـــەم: ڕێـــژەو ئامـــاری هەمـــوو بڕوانامـــەکان دەزانین، لە خوێندنی سەرەتاییەوە، تاکو پرۆفیسۆر.

دووەم: پســـپۆڕیی هەموو بڕوانامەکان دەزانین لە چ بوارێکدا بێـــت، کـــە گرنگیی زۆری دەبێـــت بۆ کاتـــی دامەزراندنو بەپێی پۆلێنبەندییەکی زۆر زانستی، هەر پسپۆڕییەکمان پێویست بێت، ڕاســـتەوخۆ لەڕێی ئەم پلانەوە، کەســـی شـــیاو دەخرێتە شوێنی شـــیاو، نەك بەو شێوازەی کە ئێستا لەڕێی دابەشکردنی فۆڕمەوە کە دەیبینین چی ڕوودەدات، کاتێك فۆڕم دابەش دەکرێت سەرباری ئەوەی کەسانی شایستەش، لەو ڕێگایەدا ناتوانرێت بدۆزرێتەوە.

سێیەم: هەر پۆستێکی بەتاڵی ئیداری، یان کارگێڕیت هەبێت، بەپێی ئەم زانیارییانە، دەتوانین کەســـی شـــیاو، لە شوێنی شیاو دابنێین، بەبێئەوەی بزانرێت ســـەر بە چ پارتێکی سیاســـییە، کە هۆکارێکی باش دەبێت؛ بۆ درووستبوونی سیستمی تەکنۆکرات.

چوارەم: لەم ڕێگایەوە، لە داهاتوودا دەتوانین بەپێی شـــوێنی نیشـــتەجێبوون، خوێندکاران لە زانکـــۆو پەیمانگاکان وەربگرین، بەپێی ئەو پسپۆڕییەی کە پێویستە بۆ هەر ناوچەیەك، بۆ نموونە: بۆ قەزایەکی وەك پێنجوێن، بۆ پێنج ســـاڵی ئایندە، پێویستت بە ١٠ مامۆســـتای بنەڕەتی دەبێت بۆ بیرکاریو کوردی. واتە: دەبێت لە کۆلێژی پەروەردەی مامۆستایان بۆ بەشی بیرکاریو کوردی لە قەزای پێنجوێن ١٠ کورســـی خوێندن بۆ ئەو دوو بەشە وەرگرێت هەرچەندە ئەم خاڵە، ســـەرەتا کەمێك قورسە، بەڵام لەداهاتوودا زۆر ئاسان دەبێت. نەك هەر مامۆستا، بگرە بۆ هەموو بوارەکانی تر، دەبێت بە شـــێوازە بکرێت بۆئەوەی پۆستی بەتاڵ بەکەسانی ئەو شوێنە پڕ بکرێتەوە، نەك بە کەسانی شوێنی تر. وەك ئێستا دەکرێت، واتە: هەر ناوچەیەك بەپێی پێویســـتی، کورسیی خۆی بۆ دیاری دەکرێتو گرنگیی ئەم خاڵە لەوەدایە کە دەبێت بەهۆی ئەوەی کە هەر ناوچەیەك، کێشـــەی کەمی پسپۆڕییەکانی نەبێت لە هیچ بەشـــێکدا. مەبەستی سەرەکیمان، ئەوەیە کە خەڵکی ئەو ناوچانە، خزمەت بە ناوچەی خۆیان بکەن، نەك لەشوێنی ترەوە بۆیان ڕەوانە بکرێتو دڵتەنگ بن.

پێنجـــەم: خاڵێکی گرنگیی ئەم دوو بەشـــە ئەوەیە، کە مەرج نییە، هەموو ســـاڵێك خوێندکار لەزانکۆو پەیمانگا تەخەڕوج پێ بکەین لەو پسپۆڕییانەی کە پێوستمان نین، یان زۆر بوون؟! واتە: مەرج نییە هەموو ســـاڵێك بۆ هەموو بەشەکانی زانکۆو پەیمانگا خوێندکار وەربگیرێتو کاتێك دەرچوو لەماڵەوە دابنیشێت.

دەگەڕێینەوە سەر خشتەی سەرەکیو چەند بەشێکی تر زیاد دەکەین بۆ خشتەکەمان:

| | ناسنامەی کەسی | ڕەگەزنامە | کۆبوونی خۆراك |
|---|---|---|---|
| + | | | |

ناســـنامەی کەســـی: ژمـــارەی ناســـنامەی هـــەر هاوڵاتییەك دەنووسرێت، خودی ناسنامە ئەسڵیەکەش دەکرێت بە فۆڕمێك بۆ هەموو کەسێك، لەگەڵ ڕەگەزنامەو کۆبوونی خۆراکو پشتگیریی شـــوێنی نیشـــتەجێبووندا، بۆ هەر فەرمانگەیەك پێویســـتیان بە هەر یەك لەم بەڵگەنامانە بوو لەڕێی ئەم ناسنامەیەوە کە جێی هەموو ناسنامەکان دەگرێتەوە، بەکار دەهێنرێت.

ڕەگەزنامـــە: بەهەمـــان شـــێوەی ناســـنامە ژمـــارەو بەرواری دەرچوونی ڕەگەزنامە دەنووسرێتو وەك فۆڕم بەکار دەهێنرێت. بۆ هەر فەرمانگەیەك کە پێویستیان بەم بەڵگەنامەیە بێت.

کۆبوونـــی خـــۆراك: وەك هـــەردوو بەشـــی پێشـــوو، ژمارەی کۆبوونەکە دەنووســـرێت، دەکرێت بەفۆڕمی تاکەکەســـی بۆ هەر فەرمانگەیەك.



# فەرمانبەری سەرکەوتوو کێیە؟

ئارام ستار بادلی

فەرمانبەر، ئەو تاکەیە کە وا لە دامودەزگا جۆربەجۆرەکاندا، بەپێی یاسا دامەزراوەو کۆمەڵێک مافو ئەرکی هەیە بۆئەوەی فەرمانبەرێکی سەرکەوتوو بێت؛ ئەوا پێویستە چەند خاسیەتو تایبەتمەندییان هەبێت، کە ئەمانەن:

**١- ڕاستگۆیی:** بۆئەوەی پێگەیەکی باشو جێی باوەڕت لای هاوکارانت هەبێت، زۆر پێویستە پارێزگاری لە سیفەتی ڕاستگۆیی بکرێتو بەرژوەندیی کەسانی تریشت لەلا بێت.

**٢- دەستپێشخەری:** فەرمانبەری سەرکەوتوو، چاوەڕوانی بەرپرسەکەی ناکات؛ تاکو ئامادەی بکات بۆ کارکردنو ئەنجامدانی ئەرکەکانی، بەڵکو بە هەموو تواناکانییەوە، کاری باش دەکات.

**٣- خاوەنی هاندەری ناوخۆیی:** ئەمەیان بەگرنگترین هاندەر دادەنرێت بۆ باش بەجێهێنانی ئەرکەکان، کە لەناو دڵو دەروونی کەسەکەدا، بوونی هەبێت، سەرەنجام بەرهەمێکی باش دێتە بوون.

**٤- جووڵان بە ئاراستەی ئامانجێکی دیاریکراو:** ئەگەر کەسێک بیەوێت سەرکەوتوو بێت؛ ئەوا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، بەپێی چەند بەرنامەیەکی دیاریکراو، هەوڵیان بۆ دەدات.

**٥- بوونی لێهاتوویی لە پەیوەندیکردنی تەندرووست:** لە گرنگترین هۆکارەکانی پێشکەوتنی فەرمانبەر لە فەرمانبەرێتیدا، ئەوەیە کە خاوەنی پەیوندییەکی تەندرووست بێت، لەڕێی نووسینو قسەکردنو هەڵسوکەوتکردنو گوێگرتن. . . هتد.

**٦- وزە:** ئەمەیان بە یەکێک لە گرنگترین فاکتەرەکان، کە توانایەکی باش بەفەرمانبەرەکە دەبەخشێت لەکاتی کارکردندا، کە فەرمانبەرەکە بەرەو پێشچوون دەچێت بە باشیو سەرکەوتنێکی باش بە فەرمانبەرەکە دەبەخشێت لە بەرامبەر ئەوانی تردا.

**٧- باوەڕبەخۆبوون:** باوەڕبەخۆبوون کارلێک دروووست دەکات لەگەڵ هەموو کارێکو زۆر هەست بەدڵنیابوون دەکات، بەتایبەتی لە کاتی کارکردنو هەڵسوکەوتکردندا. لە هەر کارێکدا، بە باوەڕێکی تەواوو بەباشترین شێوە ڕای دەپەڕێنێت.

**٨- پشت پێبەستن:** فەرمانبەری سەرکەوتوو، لە کارەکانی ڕاگری دەزگایەو بەردوامیی کارنو کارەکان بەجوانترین شێوە ڕادەپەڕێنن.

**٩- شانازیکردن:** فەرمانبەری سەرکەوتوو، هەست بە شانازی دەکات، کاتێک کارەکانی خۆی بەجوانیو سەرەنجام هەوڵدانی فەرمانبەرەکە چەندبارە دەبێتەوەو هەموو سنوورەکانی توانای بەرز دەبڕێت.

**١٠- جێگربوون:** فەرمانبەری سەرکەووتوو، لاواز نابێت بەرامبەر بارودۆخە ناهەموارەکانو هیچ شتێک نایوەستێنێتو دووره لە میزاجیبوونو ناجێگری لەکار ڕاپەڕاندن.

**١١- خاوەنی لێهاتوویی شیکردنەوەو چارەسەرکردنی کێشەکانە:**

فەرمانبەری سەرکەوتوو، لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەو ئاستەنگەکاندا، تواناو لێهاتوویەکی لە ڕادەبەدەری هەیە بەکەمترین تێچوونو کەمترین پێچوون، بۆ چارەسەرکردنی گشت کێشەکان.

**١٢- داهێنان:** فەرمانبەری سەرکەوتوو، خاوەنی داهێنانو بەرهەمی باشو بەرزە لە کاتی کارکردنو ڕاپەڕاندنی کارەکان بەباشترین شێوە.

**١٣- ڕێکخستن:** واتا: توانای فەرمانبەرەکەیە لە دابەشکردنی کارەکان بەسەر تواناکانو فەرمانبەرەکە دووره لە هەڕەمەکی بێسەروبەری، بەڵکو خاوەنی خشتەیە بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانو سەرەنجام توانایەکی لە ڕادەبەدەری هەیە بۆ هەر ڕووداوێکی پێشبینیکراوو ڕوودانی پشێوی.

**١٤- چالاکی:** واتا: فەرمانبەری سەرکەوتوو، خاوەنی چالاکییەکی بەرزە لە کارکردنو سەرەنجام بەرهەم زیاد دەبێتو کەسێکی وشیارو زیرەکە.

**١٥- بەئاگابوون لە بەرژەوەندیی کەسانی تر:** خاوەنی پەیوەندییەکی ستراتیجییە لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی هاوڕێیانیو بەئاگاشە لە پاراستنی بەرژەوەندیی کەسانی تر.



# ڕۆڵی پەروەردەو فێرکردن، لە گەشەسەندنی ئابووریدا

ئا: سەلاح عیسا ـ خوێندکاری ماستەر لە تورکیا

بەشی یەکەم

## پوختەی بابەت

پــەروەردە، یەکێکــە لەو زانســتە بنەڕەتییانەی کە پێویســتی هەمــوو کۆمەڵگەیەکە؛ چونکە تاك لە تاکێکــی بایلۆجیەوە دەکاتە تاکێکــی کۆمەڵایەتــی، واتــە: پــەروەردە ســەرجەم بەهــاو نۆرمو ڕەفتــارە کۆمەڵایەتییەکان بەهۆی پرۆســەی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە، دەبەخشــێتە تاك، بەشــێوەیەك ببێت بە کۆپییەکــی کۆمەڵگەکەی خــۆی. زانســتی ئابووریــش، یەکێکــە لەو زانســتانەی کــە لەگەڵ پــەروەردەدا، پەیوەندییەکی باشــیان هەیەو کار لە یەکتری دەکەن، هەم ئابووری دەتوانێت پەوەردەیەکی جوانترو باشتر بێنێتە کایەوە، هەمیــش پەروەردە دەتوانێت سیســتەمێکی ئابووریی پێشــکەوتوو دابمەزرێنێت، کە ببێتە هۆی زیادکردنی بەرهەمو داهاتی وڵات.

ئەگــەر لەکۆمەڵگــەدا، تاك بەدرووســتی پــەروەردە کرا، کە فێربوونیش بەشــێکە لە پــەروەردە؛ ئەوا ئەو تاکــە، دەتوانێت ببێتــە خاوەنــی بیــرو هــزری داهێنان، کــە دواتــر دەتوانێت داهێنانێکــی گەورە ئەنجام بدات، یان ئامێرێك درووســت بکات، یاخود خاوەن پرۆژەو داهاتی سەربەخۆی خۆی بێت، بە ئامانجی خزمەتکردنو بەرەو پێشــبردنی کۆمەڵگەکــەی خۆی لە هەموو ڕوویەکــەوە، بەتایبەتیــش لــە ڕووی ئابوورییەوە، بــۆ نموونە: بتوانێت بەهۆی داهێنانێکــەوە، ئابووریی وڵاتەکەی خۆی بەرەو پێشەوە ببات. بەهەمان شێوە ئەگەر ئابووریی وڵاتێك پێشکەوتوو گەشــەکردوو بێت؛ دەتوانێت یارمەتیی پرۆسەی پەروەردە بدات، ئەویش بەکردنەوەی قوتابخانەو ناوەندی نوێ لەسەر ستانداردی پێشــکەوتووی جیهانی بۆ فێربوون، یاخــود دابینکردنی هەموو هۆکارەکانــی خوێندنو فێربوون بــۆ قوتابیان، تاکو لە داهاتوودا ببنەمایەی پێشخستنی ئابووریی وڵات، کەواتە: لێرەوە پەیوەندیی بەهێزی نێوان پەرەوەردەو ئابووریمان بۆ دەردەکەوێت.

## پێشەکی

پرۆســەی پەروەردە، یاخود فێرکردن، یەکێکە لە پێداویستییە گرنگەکانــی ژیانی مــرۆڤ؛ چونکە هــەر لە منداڵیەوە ئاشــنای ڕێگاکانــی ژیانی دەکات، هەروەك چۆن وای لــێ دەکات بەهۆیەوە پارێــزگاری لە بوونی خۆی. وەکــو تاکێکی ناو کۆمەڵگەکەی بکات. هەر لە ســەرەتای لەدایکبوونی منداڵەوە، ئەم پرۆســەیە دەســت پــێ دەکاتو دەکرێت تا مردن بــەردەوام بێت؛ چونکە ناکرێت لە قۆناغێکدا بوەستێتو هیچ کەسیش ناگات بە پلەی کەمال کە چیتر پێویســتی پێ نەبێت، بەڵام دەکرێت جۆرەکەی بەپێی قۆناغەکانی گەشــەی مرۆڤ، گۆڕانکاری بەســەردا بێت، گرنــگ ئەوەیە مرۆڤ لەهەر تافێکدا بێت، هەر پێویستی بەپەروەردەو زانینە.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم پرۆسە گرنگەدا، لەم باسەدا هەوڵم داوە، تیشك بخەمە ســەر گرنگیــی پەروەردەو کاریگەرییەکانی لەســەر لایەنێکی تــری گرنگی ژیانی مرۆڤ، کە ئەویــش پەیوەندیی نێوان پەروەردەو ئابــووری، هەروەها کاریگەرییەکانێتی لەو بــوارەدا؛ بۆئەوەی بزانین چــۆن کار لە یەکتری دەکەن، بەتایبەتــی پەروەردە چی گرنگییەکی بۆ باری ئابووری هەیە، ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان سیستەمی ئابووریــی وڵاتێکی دواکەوتوو لــەڕووی ئابوورییەوە، لەگەڵ وڵاتێکی پێشکەوتوودا؛ ئەوا بەڕوونی پەیوەندیی نێوان ئەو دوو لایەنەمان بۆ دەردەکەوێت؛ چونکــە وڵاتە دواکەوتووەکە، کە ئابوورییەکەی لاوازە، ناتوانێت وەکو پێویست پەروەردەیەکی تەندرووست بەتاکەکانی بدات، یاخود فێری زانستی پێشــکەوتووی سەردەمیانەیان بکات، لەبەرئەوە هەر دەبێت پاشــکۆی وڵاتە پێشــکەوتووەکان بێت؛ چونکە لەو وڵاتە دواکەوتووەدا، هەر زانستە کۆنەکان دەخوێندرێنو هەر بەڕێگای کۆن، ئەزموونــەکان ئەنجــام دەدرێن، ئەمەش هیــچ ئەنجامێکی لێ بەدی نایەتو نابێت بەهۆی پێشــکەوتنی ئەو وڵاتەو دەرچوون لە قۆناغی دواکەوتوویــی. بەپێچەوانەشــەوە وڵاتــە پێشــکەوتووەکان، ئەوانەی خاوەن ئابوورییەکی بەهێزن، بەهەمان شێوە خاوەن پێشکەوتووترین سیســتەمی پەروەردەشــن؛ چونکە ئەوەی پێویســتە بۆ پــەروەردە، بەئاســانی فەراهەمیــان کردووە، بۆیە هەمــوو کات مرۆڤی داهێنەر، هەر لەم کۆمەڵگایانەوە دەردەکەون، ئیتر ئەمە پرۆسەیەکی تێکەڵاوە، بــەردەوام پەروەردە تاکی بە ســوود پێشکەشــی کۆمەڵگە دەکات، کە بتوانێ ئابووریی وڵات پێش بخات، هەروەها ئابووریش کارێك دەکات، کە سیستەمی پەروەردە بەجوانی بەڕێگەی خۆیدا بڕوات.

ئەم بابەتە دەچێتە چوارچێوەی کۆمەڵناسیی پەروەردەییەوە، کۆمەڵناسیی پەروەردەییش، لقێکە لەلقەکانی زانستی کۆمەڵناسی، هەروەهــا ئابووریــش جێگەی بایەخــی کۆمەڵناســییە؛ چونکە بەشێك لە کێشــە کۆمەڵایەتییەکان، هۆکارەکەی بۆ خراپی باری ئابووری دەگەڕێتەوە. کەواتە: ئەم بابەتە گرنگە لە کۆمەڵناسیدا؛ چونکــە گرنگی بە پەروەردەی تــاك دەدات لەناو کۆمەڵگەدا، کە خێزانو قوتابخانەو دەزگا پەروەردەییەکان دەگرێتەوە، بەهەمان شــێوە کۆمەڵناسیش، گرنگیی تایبەت بەو بوارانە دەداتو لە تاك دەکۆڵێتەوە لە کۆمەڵگەکەیدا، کۆمەڵناســی وای دەبینێت، بەشێك لە هۆکارەکانی کەمکردنەوەی کێشــەکان، بەهۆی پەروەردەیەکی تەندرووســتو ئابوورییەکــی جێگیــرەوە دەبێــت، کــە ئەمەش ئەرکی ئەو لقەی کۆمەڵناســییە، کە پێی دەگوترێت: کۆمەڵنایسی پەروەردەیی؛ بۆئەوەی کێشە ئابوورییەکانیش لەو ڕێگەیەوە، هەر بەهۆی پرۆسەی پەروەردەو فێرکردنەوە، چارەسەر بکرێن.

# نهێنییەکانی سەرکەوتن لە بازاڕسازیی ڕایەڵەدا

## (نێتۆرك مارکێتینگ)

بەشی چوارەم

و: ئانا هەورامی



## سەرکەوتن، یان شکست لە ٩٠ ڕۆژی یەکەمدا

## نێتۆرکی مارکێتینگ، چ شتێك نییە؟ "هاوزادی شەڕ"

پێش ئەوەی کە زیاتر ڕۆبچین، پێویستە کە حەقیقەتی نێتۆرکی مارکێتینگ، زیاتر ڕوون بکەینەوە. پێش هەلگرتنی هەنگاوی یەکەم، سەرەتا پێویستە چوارچێوەیەکی هزری گونجاو، لە ڕەهەندی بازرگانیی NM هەبێت. ئەم بابەتە لە سەرکەوتنی تۆ لە بازرگانیدا، گرنگییەکی زۆری هەیە.

*** پێکهاتەی فووچەکی:**

هەر بەو شێوەیەی کە لە بەشی یەکەمدا، ڕوون کرایەوە، نێتۆرکی مارکێتینگ، پێکهاتەیەکی فووچەکیو هەرەمی نییە. لە ئەنجامدا، NM ڕێکارێکی یاساییو مەشرووعە بە ئاڕاستەی دابەشکردنی کاڵاو خزمەتگوزارییەکان.

*** ڕێکاری یەك شەو دەوڵەمەندبوون:**

NM بەدڵنیاییەوە، ڕێگای یەك شەو دەوڵەمەندبوون نییە، بەڵکو شێوازێکە کە پێویستی بە هەوڵی بەرفراوانی تۆ هەیە، بۆ ڕیکلامی بەرهەمو خزمەتگوزارییەکانو پێکهێنانی کۆمەڵە. NM سیستمێکی دادگەرانەیە کە لە بەرامبەر هەوڵەکانتاندا، پاداشتتان پێ دەدات، نەك لە بەرامبەر بە زۆریی ماوەی هاتنت بۆ ناو ئەم سیستمە.

*** کاری ئاسان**

نێتۆرکی مارکێتینگ، بازرگانییەکی ئاسان نییە. لە ڕاستیدا، NM کارێکە کە لەگەڵ زۆرینەی کارە ئاساییو خۆماڵییەکاندا، جیاوازییەکی زۆری هەیە. سەرمایەی پێشەکیو مەترسی لەم بازرگانییەدا زۆر کەمە، بەڵام بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن، هەوڵدانو پێداگرییەکی زۆر پێویستە. هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە، کە زۆرینەی خەڵك، واز لەم بازرگانییە دەهێنن.

*** هێنانە ناوەوەی چەند کەسێك بۆ ناو کارەکەو سەرکەوتنی لە سەدا سەد:**

تەنها هێنانە ناوەوەی کەسێك بۆ ناو بازرگانییەکە، تۆ بەسەرکەوتن ناگەیەنێت. پێویستە کۆمەکییان بکەیت، هانیان بدەیتو بیرۆکەیان پێ بدەیت، هەروەها فێریشیان بکەن؛ چونکە سەرکەوتنت بەندە بە سەرکەوتنی ئەوانەوە. لەبەرامبەر ئەمەشدا، پێویستە هەمیشە بەدوای کەسانی نوێدا بگەڕێیت؛ تا ببنە جێگرەوەی ئەو کەسانەی کە لەوانەیە کارەکە بەجێ بهێڵن.

کەسەکان لەم جۆرە بازرگانییەدا، دابەش دەبن بە چەند دەستەیەکەوە: ئەوانەی کە هیچ کارێك ناکەن. ئەوانەی تەنها بەکارهێنەری بەرهەمەکانن. ئەوانەی بەشێوەی پارتتایم کار دەکەن. ئەوانەی هەموو کات کار دەکەن، ئێمە ئەو کەسانە بە کەسانی بونیادنەری کۆمەڵە ناو دەنێین. بەداخەوە، بەشێکی زۆری کەسانی کارکەر لە NM، لە دەستەی یەکەمو دووەمدان.

*** پێویست نەبوون بە هەر جۆرە خەرجییەك:**

ئەم بابەتە لەبارەی NM ڕاست نییە. NM بازرگانییەکە کە لە سرووشتدا پێویستی بە خەرجیگەلێك هەیە. گەرچی ئەم خەرجییانە زۆر نین، بەڵام خۆ هەر هەن. پێویست ناکات

ئۆفیسێکی کاری پانو بەرین بەکرێ بگریتو ژمارەیەکی زۆر کارمەند دابمەزرێنن؛ هەتا کارت بۆ بکەن، بەڵام پێویستە بۆ هەندێك شتی پێویستی، پارە خەرج بکەیت. بۆ نموونە: ناچاریت بۆ بەرەو پێشبردنی کاریگەریی کار لە کۆمەڵەکەتدا نووسینگەیەکی ماڵیی (Home-office) سادەت هەبێت. پێویستە خەرجیی هاتوچۆکان، بەشداری لە سیمینارەکان، کڕینی سیدی فێرکاریو کتێبو شتی تر بدەیت. خەرجییەکی زۆر نییە، بەڵام لە هەموو کاتێکدا، ئەگەر بتەوێت بەجددی کاربکەیتو سەرکەوتوبیت، پێویستە بەم خەرجییانەش ڕابگەیت.

* کارێکە هیچ مەترسی تێدا نییە

مەترسیی NM زۆر کەمە. لەگەڵ ئەمەشدا، هیچ نەبێت مەترسییەك بوونی هەیە. هەموو کەسێك لەم بازرگانییەدا بە سەرکەوتن ناگات. ئەڵبەتە زیانو مەترسیی ئەم بازرگانییە بە بەراورد لەگەڵ بازرگانییە ئاساییەکاندا زۆر کەمە. سەرنەکەوتنیش لەم بازرگانییەدا، تا ڕادەیەك بێکاریگەرە، بەهۆی کەمیی خەرجو مەترسییەکەیەوە.

* پێویستی بە فرۆشتنی بەرهەم نییە

ڕێك وەکو بازرگانیی ئاسایی، لەم بازرگانییەشدا هەمیشە پێی فرۆشی بەرهەمو خزمەتگوزارییەکان لە ناودایە. نێتۆرکی مارکێتینگیش، لەم یاسایە بەدەر نییە. پێویستە کاڵا، یان خزمەتگوزارییەکە بە فرۆش بگات؛ هەتا کۆمپانیا سوودمەند ببێتو توانای دانەوەی قەرزو پاداشتەکانی بە کڕیارەکانی هەبێت. NMبازرگانییەکە کە لە سەر بنەمای هاوشێوەسازی بونیاد نراوەو گرنگە کە فرۆشتن لە کۆمەڵەدا هاوشێوەسازی بکرێت.

* باڵادەستەکانم یارمەتیم دەدەن!

باڵادەستەکانت بە مەرجی سەرکەوتن، سوودت پێ دەگەیەننو لەبەر ئەم هۆکارە بە هەر ڕێگایەك، کە بتوانن، یارمەتیت دەدەن. لەگەڵ ئەمەشدا، پێویستە هەمیشە لە یادت بێت، کە NM بازرگانیی خودی خۆت دەبێت، لەبەرئەوەش خۆت بەرپرسی سەرکەوتنی خۆتیت. باڵادەستەکان ناچار نین کە یارمەتیتان بدەن. لەوانەیە هەندێك لە باڵادەستەکان زۆر چالاك نەبن، یان کاتی کۆمەککردنیان بە تۆ نەبێت. لەم حاڵەتانەدا پێویستە خودی خۆت هەوڵ بدەیت، لە باڵادەستەکانی ترتەوە، کۆمەك وەربگریت. ئەگەر هیچ کەسێك نییە، یارمەتیت بدات، پێویستە خۆت پێشەوای خۆت بیت. لە ڕاستیدا، ئەگەر سەربەخۆییەکی زیاترت هەبێتو خۆت کارەکانت ئەنجام بدەیت، سەرکەوتنێکی زیاتر بەدەست دەهێنیت.

* دەتوانرێت لە هەر کاتێکدا کارەکە بوەستێنرێتو داهات بۆ هەمیشە بە لێشاو دابڕێژرێت بەسەریاندا:

نێتۆرکەر مارکێتەرێکی زۆر سەرکەوتوو هەن، کە کۆمەڵەکەلی زۆر گەورەیان بونیاد ناوەو ئێستاش بە داهاتی بەرکاری گەشتوون. بە دەربڕینێکی تر، ئەوان ئیتر ناچار نین کار بکەن. ئەم بابەتە لە هەندێك باردا ڕاستە، بەڵام پێویستە کۆمەڵەیەکی سالمو بەهێزت هەبێت، تەنانەت هەمان ئەم نێتۆرکەرە سەرکەوتوانەش، هێشتا کاتێك تایبەت دەکەن، بە بەڕێوەبردنی بازرگانیی نێتۆرکی مارکێتینگیان. لە ڕاستیدا جێگای داخە، هەندێك لە تازەکاران بە هەڵە وا بیردەکەنەوە، کە دوای ماوەیەکی کورتی کارکردن، دەتوانرێت کارەکە بوەستێنرێتو داهات بۆ هەمیشە دەڕژێت بەسەریاندا.

* من بۆ سەرکەوتنی باڵادەستەکانم کار دەکەم

NM بازرگانێکە لە تۆوەیە. تۆ گەرەنتیو دەستەبەری سەرکەوتنی خۆتیت، نەك سەرکەوتنی کەسانی تر. باڵادەستەکانت پێویستیان بە چاودێریت لە لایەنی فێرکردن، ڕێنماییو بیرۆکەپێدان هەیە. کۆمپانیا لەبەرامبەر هەوڵەکانیاندا پارەیان پێ دەدات. ئەم داهاتە ڕاستەوخۆ لە کۆمپانیاوە بەدەست دێت، نەك لەڕێگەی کەمکردنەوەی داهاتەکانتەوە. هەرکاتێکیش یارمەتیی ژێردەستەکانت بە ئاڕاستەی سەرکەوتن بدەیت، کۆمپانیایش شاباشت پێ دەدات. ئەگەر لە ڕاستیدا مەبەستتە لەم کارەدا سەرکەوتنێکی گەورە بە دەست بهێنیت، پێویستە NM بە ناونیشانی بازرگانیی خۆت سەیر بکەیت. تەنها ئەو کاتە بەقووڵو فاڵی کار دەکەیت، کە ئەم بازرگانییە بە چاوی بازرگانییەك بۆ خۆتو ئەو کەسانەی کە خۆشت دەوێن سەیر بکەیتو ئەنجامی بدەیت، نەك بۆ کەسانی تر.

* من بزنسمانێکی سەرکەوتووەو بە تەنها دەتوانم ئەم کارە لە ئەستۆ بگرم..

NM لە زۆر لایەنەوە، لەگەڵ بازرگانیی ئاساییدا جیاوازە. ئەگەر دەتەوێت سەرکەوتوو بیت، ناچاریت بنەما سەرەتاییەکانی بازرگانیی NM فێرببیت. لەوانەیە بزنسمانو بازرگانێکی سەرکەوتوو بیت، یان لە پیشەیەکی تردا سەرکەوتنگەلێکت بەدەست هێنابێت، بەڵام ئەگەر خۆپەسەندیی خۆت نەخەیتە لاوەو دەست بە فێربوون نەکەیت، سەرکەوتوو نابیت. لەوانەیە باڵادەستەکانت بە ئەندازەی تۆ، لە پیشەی کارەکەی تۆدا شارەزاییان نەبێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە لە نێتۆرکی مارکێتینگ ـ کە تۆ تێیدا تازەکاریت ـ لەچاو تۆدا زانیاریو ئەزموونێکی زیاتریان هەیە. "چاولێبرێکی ڕەسەن"بیت، هەتا سەرکەوتوو بیت.

* پێویستە تەواوی کات کار بکەیت، هەتا سەرکەوتوو بیت

کەسانێکی زۆر هەن، کە ئەم بازرگانییەیان بە شێوەی پارتتایم ئەنجام دەدەنو سەرکەوتنیشیان بەدەست هێناوە. پێویستی بەوە نییە کە ئەم کارە لە تەواوی کاتدا ئەنجام بدرێت. لەگەڵ ئەمەشدا، هەندێك هەر کە بە ئەندازەیەك سەرکەوتن دەگەن، کاری پێشوویان واز لێ دەهێنن. هەڵبەتە ئەمە بڕیارێکی تایبەتییە. پێویستە لەیادت بێت، کە گەرچی دەتوانرێت ئەم کارە لە پارتتایمدا ئەنجام بدەیت، ئەگەر دەتەوێت سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بهێنیت، پێویستە زهنییەتێکی هەمیشەییت هەبێت. ئەگەر خوازیاری سەرکەوتنیت، لەم بازرگانییەدا، پێویستە لانی کەم لە هەفتەیەکدا ٢٤ کاتژمێر، بۆ ئەم کارە تەرخان بکەیت.

ئامانجی گشتیی ئەم بەشە، ترساندنی تۆ نییە لە NM. مەبەست، ئامادەسازیی تۆیە، هەروەها ڕوونکردنەوەی چەند ڕاستییەکە لەبارەیNM. بەڕاستی ئەم بازرگانییە، لە باشترین ئەو چالاکییانەیە، کە ڕووبەڕووی دەبیتەوە. ئەو سەرکەوتنانەشی کە بەدەستی دەهێنیت، زۆر زیاترن لەو کێشانەی کە لەوانەیە لەمیانەی کارەکەدا ڕووبەڕووت ببێتەوە. ئەگەر بتەوێت گەورەترین دەرفەت بەدرێژایی مێژووی دونیا لەدەست نەدەیت، پێویستە لە سەرەتای کاردا، زانیاریی درووست، پێشبینی بەجێو زهنییەتێکی ڕوونت لەبەرامبەر کارەکەدا هەبێت.



بڕیاری منداڵان

پەیام

# درۆ هەر درۆیە، با یەك وشەش بێت!



لە دێر زەماندا، شازادەیەك هەبوو، پادشای باوکی کۆچی دوایی دەکاتو ماڵاوایی لە ژیان دەکات، شا تەنها شازادەیەکی مێردمنداڵی لە دوای خۆی جێهێشت، بەڵام لە پێش مردنیدا مامۆستایەکی تایبەتی بۆ دابین کردبوو؛ بۆئەوەی فێری وانەکانی ژیانی بکاتو بەردەوام چاودێری بکات، بەمەبەستی پاراستنی لە ناحەزو دوژمنەکانی، تا ئەو کاتەی بەتەواوی گەورە دەبێت.

کاتێکیش شازادە بە تەواوی گەورە بوو، داوای لە جەنابی مامۆستا کرد، تکایە جێم مەهێڵە، باوکم وەسیەتی بۆ کردووم، کە هەرگیز واز لە ئامۆژگاریو حیکمەتەکانی تۆ نەهێنم؛ چونکە تۆ پەروەردەکارێکی لێهاتوویت، زیاتر فێری وانەکانی ژیانم بکە، جەنابی مامۆستاش داواکارییەکەی شازادەی پەسەند کردو لە کۆشکدا لەگەڵ شازادەدا مایەوە؛ تا بەردەوام وانەی دانایيو حیکمەتی فێر بکات.

ڕۆژێکیان شازادە لەگەڵ پیاوماقووڵانی شار کۆبوویەوە، لە دانیشتنەکەدا مامۆستاکەی ئامادەبوو، بەڵام جگە لە چاودێریی شازادە هیچ قسەیەکی نەکرد، دوای ئەوەی کۆبوونەوەکە تەواو بوو، پیاوماقووڵانی شار کۆشکیان جێ هێشتو لە دیوەخانی کۆشکدا، تەنها مامۆستاو شازادە مانەوە، شازادە بە مامۆستاکەی گوت: بۆچوونت چی بوو لەسەر دانیشتنی ئەمڕۆمان لەگەڵ پیاوماقووڵانی شار؟

مامۆستاکەی گوتی: زۆر بەداخەوە، قسەکانت جوان بوون، بەڵام ببوورە قسەیەکت کرد کە ڕاست نەبوو!

شازادە دەستی بە پێکەنین کردو گوتی: تەنها قسەیەك هیچ نییە، واتە: درۆیەك بە تەنها کێشە نییە، شازادە ئەو ڕۆژەی بەڕێ کردو شەوگار داهات، ڕۆیشتە ژووری نووستنەکەیو بەئارامی خەوت، بەڵام مامۆستا ئەو شەوە خەو نەچووە چاوەکانی؛ چونکە هەستی دەکرد بەشێکی تاوانی ئەو درۆیە، دەکەوێتە سەرشانی؛ لەبەرئەوەی شازادە لەسەردەستی مامۆستا پەروەردە بووە، بەردەوام بیری لە ڕێچارەیەك دەکردەوە، تا شازادە فێر بکات، درۆ ئەگەرچی کەم بێت، یان بچووك بێت، هەر پێی دەگوترێت درۆ. . چونکە مرۆڤ لە درۆیەکەوە، فێری درۆی زۆرترو گەورەتر دەبێت.

کاتێك بۆ سبەی خۆرهەڵات، مامۆستا لە ژوورەکەی چووە دەرەوەو ڕۆیشت بۆ گەنجینە ئاڵتوونییەکەی پادشا، سکەیەکی ئاڵتوونی لە گەنجینەکە هەلگرت، دەرگای خەزێنەکەی داخستەوەو بەرەو ژوورەکەی خۆی گەڕایەوە، لە کاتی گەڕانەوەیدا پاسەوانێکی پاشا چاوی پێ کەوتو بینی سکەیەکی ئاڵتوونی پێیە، بە پەلە خۆی گەیاندە لای پادشاو پێی گوت: کە مامۆستاکەی سکەیەکی ئاڵتوونی هەلگرتووە!

پادشا گوتی: مامۆستام بۆ بانگهێشت بکەن، مامۆستا هات بۆ لای پادشا، جەنابی پادشا بەتووڕەییەوە گوتی: تەواوی سامانو سەروەتم خستۆتە بەردەستت، هیچ پاساوێك نییە؛ بۆئەوەی ناچاربیت دزی لە ماڵی من بکەیت! هەر لە منداڵیمەوە، تۆ منت لەسەر ئەمانەتو دەستپاکی، پەروەردە کردووە. کەواتە: چۆن بوو، تۆ سکەیەکت لە گەنجینەی من دزیوە؟

مامۆستاکەی زۆر بەئارامی وەڵامی دایەوەو گوتی: جەنابی پادشا، ئەوە بە دزی لە قەڵەم نادرێت؛ چونکە من لە هەموو گەنجینەکەی تۆ، تەنها یەك سکەم هەلگرتووە!

پادشا گوتی: دزی هەر دزییە! ئەو کەسەی یەك سکە هەڵدەگرێت، پێی دەگوترێت دز، ئەو کەسەشی هەموو سکەو گەنجینەکە دەدزێت، هەر پێی دەڵێن دز!

لێرەدا مامۆستا هەستی کرد پلانەکەی سەری گرتووە، لەبەرئەوە زەردەخەنەیەکی کردو سکە ئاڵتوونییەکەی لە گیرفانی دەرهێناو فرێی دایە بەردەمی پادشاو پێی گوت: جەنابی پادشا، درۆش هەر درۆیە، گەرچی یەك وشەش بێت، ئەو کەسەی یەك وشە بە درۆ دەردەبڕێت، وەکو ئەوە وایە لە هەموو قسەکانیدا درۆی کردووە! تۆش دوێنێ یەك درۆت کرد، دواتر گوتت: تەنها درۆیەك زیانی نییە. . منیش بەم ڕێگەیە ویستم وانەیەکت فێربکەم!

پادشا وێڕای ئەوەی داوای لێبوردنی لە مامۆستاکەی کرد، هاوکات زۆر سوپاسی پەندو ئامۆژگارییەکەی کردو لەو ڕۆژە بەدواوە، تەنها پیتێکیشی بە درۆ دەرنەدەبڕی!




# مادده هۆشبەرەکان
## ٢/٢

٢. جۆرەکانی مادده هۆشبەرەکان:

ج. کۆمەڵەی حەشیشە(ماریجوانا) (قەنب) (کیف):

حەشیش ناوی زۆرە، بەپێی ئەو ناوچەیەی تێیدا دەچێنرێتو ئامادە دەکرێت (٣٥٠)ناو تێدەپەڕێنێت. . گرنگترین مادده لە حەشیشدا، ماددەی تێتراهایدرۆکانابینۆڵ( THC)ە. کەسەکە هەست بە چالاکیو پێکەنینو قاقای بێهۆ دەکات، لەگەڵ وێنەو دەنگی نامۆی بێبنەما. زۆر جار بەوە جیا دەکرێتەوە کەسەکە گێژوحۆل دەبێت، نەك شەڕانی، وەك خواردنەوەی کهوول. کەسەکە قەبارەو دووریو شێوەی شتەکانی لێ تێکدەچێت، کات زۆر بەخاوی دەڕوات، یادگەی کورتخایەنی(ئەو بەشەی زاکیرە کە زانیاری بۆ کاتێکی کورت هەڵدەگرێت لەسەرەتاوە) تێکدەچێت، چاوی سوور دەبێتو لێدانی دڵی زیاد دەکات. هەرکە وازی لێ هێنا، یەکسەر هەست بە خەمۆکییو نیگەرانییو تێکچوونی نووستنو لەرزینی لەش دەکات. بەڵام ئاسانە وازلێهێنانی. پاش ماوەیەك پاڵنەرەکان لەدەست دەدات، هەست بەتەممەڵیو مێشك لاوازی دەکات، تەرکیزی نامێنێت، بەرەو بیری تاوانکاری دەچێتو توانای سێکسی لاواز دەبێت.

د. کۆمەڵەی ورياکەرەوەکان(Stimulants): ئەمانە وریاکردنەوەی ناوەندە کۆئەندامی دەمار "CNS" ئەنجام دەدەن، لەبەرئەوەی وزە بەرهەم دەهێنێت هێزو چالاکی دەبەخشێتە بەکارهێنەرەکە، تەنانەت گەر ماندوو بێهێزیش بێت، کەسەکە دەتوانێت بۆماوەیەکی زۆر، بەبێ نووستن خۆی بگرێت. بەڵام زۆر بەکارهێنانی ئالوودەبوونێکی ترسناکی بەدواوەیە. ئەم جۆرانەن:

* کۆکایین: لە ڕووەکی کۆکا دەردەهێنرێت، کە لە ئەمریکای باشوور هەیە. زیاتر بەشێوەی هەڵمژین وەردەگیرێت، پەردەی لووت تێدەپەڕێنێتو دەگاتە ناو خوێن. . ئەم هەڵمژینە زۆرەش، ڕەنگە ببێتەهۆی برین لەپەردەی لووتو نێوان دوو کونەکەیدا. لەهەموو جیهان یاساغ کراوە، بەڵام ئەمریکا بۆیان کۆنترۆڵ ناکرێت، لەبەربوونی ڕووەکەکە تێیدا. کۆکایین زۆرترین ئالوودەبوونی دەروونی دروست دەکات، وەلێ هیرۆیین زیاترین ئالوودەبوونی جەستەیی دروست دەکات. گەر بۆماوەیەکی کەم بەکاری بهێنێت، کەسەکە هەست بە کامەرانیو چالاکی دەکات، ڕەنگە بەدوای خۆیدا نیگەرانیو ترسو خەیاڵاتی بێبنەما بهێنێت. بەڵام بەکارهێنانی بڕێکی زۆر، دەبێتە هۆی کەمخەوی، لەش لەرزانو ماسوولکە گرژبوون، کەسەکە وا دەزانێت ژێر پێستی، مێرووی تێدایە، هەرسی تێکدەچێت، بیلبیلەی چاو فراوان دەبێت، گوشاری خوێنی بەرز دەبێتەوەو لەکۆتاییدا مردنی لەناکاو.

* ئەمفیتامین: کەسەکە بۆچەند کاژێرێك هەست بە چالاکیو گوڕو تین دەکاتو خەوی نایەت، پاشان تەممەڵ دەبێتو تەرکیزی نامێنێتو توندوتیژی لێیەوە دەردەکەوێت. ئالوودەبوونیش دەبێتە هۆی نەمانی پشووو لاوازیی سێکسیی، یان ڕەنگە ورووژانی سێکسی. دەرمانێکی لێ دروست دەکرێت پێی دەگوترێت(کابتاگۆن)خوێندکاران کاتی تاقیکردنەوە بەکاری دەهێنن، پێویستە لێی دوور بکەوینەوە.

ه. خەولێخەرەکان(Depressants): کاردەکات بۆ خاوکردنەوەی ناوەندەکۆئەندامی دەمارو کەسەکە هێور دەکاتەوەو خەوی لێ دەخات. . هەندێکیان کەسەکە تووشی خووپێوەگرتنی دەروونی دەکەن. تا بکرێت پێویستە خۆمانی لێ بەدوور بگرین، مەگەر بۆ کاتێکی دیاریکراو نەبێت کەسێك نەخۆشبێت، یان ئاڵۆزییەکی هەبێتو خەوی لێ نەکەوێت.

٣. کاریگەریی مادده هۆشبەرەکان:

گومانی تێدا نییە کەسی ئالوودە کەسێکی کوژراوەو بەڵام لە نێو زیندووان هەژمار دەکرێت، هەمیشە بەرەو مردنێکی لەناکاو ڕادەکێشرێت. دەبینیت کەسێکی نائاسایی، لاواز، تەندرووستی لەدەست داوە، بێهێزو لاوازەو نیمچە شەلەلێکی هەیە. سەرەنجام هیچ کارو پیشەیەکی پێ ناکرێت، دەبێت چی سەروەتی هەیە بیدات بە مەواد، لە خێزانەکەی دوور دەکەوێتەوەو گۆشەگیر دەبێت، ڕەنگە خێزانەکەی، یان کچەکەی ناچار بکات بە داوێنپیسی؛ تاکو پارەی دەست بکەوێت!!. هەروەها ماددەی هۆشبەر کات بەفیڕۆ دەدات، مێشك لە خاوەنەکەی دەسێنێتەوە، کەسەکە دەخاتە باری بێئاگاییەوە، ڕەنگە پەلکێشی بکات بۆ ئەنجامدانی تاوانو ستەمو بێگومان لە خودای خۆی دووری دەخاتەوە.

٤. نامەیەك بۆ هەموو باوکان. . چۆن منداڵەکەت دەپارێزیت لە ماددەی هۆشبەر؟:

* گرنگترین ڕێگا پەروەردەکردنیەتی لەسەر ڕێگای ڕاستو دروستو تەرخانکردنی بەشێك لەکاتەکانت بۆ ئامۆژگاریو بەرچاو ڕۆشنکردنەوەی.

* هاوڕێی باشی بۆ بدۆزەرەوە، ئاگاداری بکەرەوە لە هاوڕێی خراپو بزانە هاوڕێکانی کێن.

* زۆر بەراشکاوی، باسی ئەم بابەتانەی بۆ بکە لە تەمەنی(١٢ ساڵیی)و پێش ئەوەی کارلەکار بترازێت.

* ڕێگرییان لێ بکەو ئاگاداریان بکەرەوە لە جگەرەو خواردنەوە، ئەو کەسانەی ئەمانە بەکار بهێنن زیاتر بەرەو ماددەی هۆشبەر دەچن.

* سەرمەشقێکی باشی نەوەکانت بە، بەوەی لە هەموو ئەم شتانە بەدووربیت (جگەرە، خواردنەوە، . . هتد).

* منداڵەکانت هان بدە بەشداری لە وەرزشو چالاکیی بەسوودو وانەی قورئاندا بکەنو گەشتو سەیرانی خۆشیان بۆ ڕێك بخەن.

* هەمیشە ئاگات لێیان بێتو وریایانە چاودێرییان بکەو لە ماڵەوە بەتەنیا جێیان مەهێڵن.

* ئاگاداری گۆڕانکاریی نامۆ بە لە ڕەفتاری منداڵەکەت (شەڕەنگێزیی، تووڕەبوونی بەردەوام، خەمۆکیو گۆشەگیری، دابەزینێکی بەرچاو لە ئاستی خوێندن. . هتد).

ن: د. حسان شمسی پاشا

و: یەحیا محەممەد عەلی



# زەردەچەوە

زەردەچـــەوە، یەکێکە لەو بەهاراتانـــەی بە ڕەنگو تامێکی تایبەت جیـــا دەکرێتەوە کە لـــە بوارەکانی خواردنو دروووســـتکردنی تێکەڵەی سرووشـــتی بۆ جوانکارییەکانی پێست، ســـەرەڕای ئەوەی بۆ چارەسەرە تەندرووســـتییەکان دەچێتـــە بـــواری چارەســـەری سرووشـــتییەوە بۆ چەندین نەخۆشی.

زەردەچەوە، سەدان ساڵ پێش ئێستە لەڕێی بواری پزیشکی چینیو هندیی کۆنەوە ناســـراوە، بۆ چارەسەری چەندین کێشەی تەندرووستی، وەك بەدهەرســـیو هەوکردنی جومگەکانو ئاوســـانی ســـكو خەمۆکیو چەندین نەخۆشیی باوی تر بەسوودە، بەهۆی بوونی چەندین توخمی خۆراکی گرنگ تێیدا، وەك پرۆتینو ڕیشاڵەخۆراکییەکانو ڤیتامینەکانی (Cو Eو K)و توخمە کانزاکانی وەك یۆدیۆمو پۆتاســـیۆمو کالیســـیۆمو مسو ئاسنو مەنگەنیزو مەگنیسیۆم.

دەتوانرێن زەردەچەوە بەشێوەی هاڕاو، بۆ چەندین جۆری خۆراك تێکـــەڵ بکرێـــت وەك هێلکە، شـــەربەت، شـــیری گەرم، یـــا دەتوانرێت بەشێوەی حەب لە دەرمانخانەکان دەست بکەوێت.

## سوودەکانی زەردەچەوە

**یەکەم: دژەهەوێکی بەهێزە:** بەتایبەتی بۆ هەوکردنی جومگەکان، زەردەچـــەوە کۆمەڵەیەکـــی گەورەی لە ماددە دژەئۆکســـێنەرەکانو ماددەکانـــی دژەڤایـــرۆسو میکرۆبو کەڕووی تێدایـــە، هەروەها چەند تایبەتمەندییەکی دژەشـــێرپەنجەو دژەهەوکردنـــی تێدایە، ئامۆژگاریی ئـــەو کەســـانە دەکرێـــت، کـــە هەوکردنـــی جومگەکانیان هەیـــە، وەك چارەسەرێکی سرووشتی بەکاری بهێنن، سەرەڕای ئەوەش وەك کارایەکی پاکژکـــەرەوە بەتایبەتی لـــە خاوێنکردنەوەی برینو ســـووتاویو خێرا سارێژکردنی، لەگەڵ ئەوەشدا، ئازارشکێنێکی زۆرباشە.

دەتوانیت کەوچکێکی بچووك لە هاڕاوەی زەردەچەوە، تێکەڵی یەك کوپ شیری گەرم بکەیتو پێش چوونە سەرجێگاو خەوتنت بیخۆیتەوە بۆ ڕێگریکردن لە هەوکردن.

**دووەم- بەرەنگاری شێرپەنجە دەبێتەوە:**

چەندیـــن توێژینەوە باس لـــە بوونی مـــاددەی (کیورکیومین) کە توخمێکـــی چالاکە لە زەردەچـــەوەدا، دەتوانێت هانـــی خانەکان بدات، هەســـتن بەکـــرداری تێشـــکاندنی خۆیـــی خانـــە شـــێرپەنجەییەکان، هەروەهـــا توێژینـــەوەکان جەخت لـــە گرنگیی زەردەچـــەوە دەکەنەوە لـــە بەرەنگاربوونـــەوەی شـــێرپەنجەو پاراســـتنی لـــە دروووســـتبوونی گـــرێ شـــێرپەنجەییەکان، ئەویـــش بەخواردنـــی کەوچکێکـــی بچووك لـــە زەردەچـــەوە، هەروەهـــا خانە شـــێرپەنجەییەکان تێکدەشـــکێنێت بەهـــۆی دژەئۆکســـێنە بەهێزەکانی نـــاوی، یارمەتیی پاراســـتنی دەدات لە شـــێرپەنجەو وەســـتاندنی گەشـــەی خانە شـــێرپەنجەییەکان، وەك شـــێرپەنجەی پرۆســـتاتو کۆڵۆنو مەمكو پێســـت، هەروەها مەترسی تووشبوون بە شێرپەنجەی خوێن کەم دەکاتەوە، بەتایبەتی لە قۆناغی منداڵیدا. لەوەش گرنگتر ئەوەیە، کاریگەریی بەکارهێنانی چارەســـەری کیمیایـــی کەم دەکاتەوە، خواردنی زەردەچەوە لەگەڵ قەرنابیتی لێنراو ڕێگری لە شێرپەنجەی پرۆستات دەکات.

**سێیەم- تەندرووستی جگەرو کارکردن لە لابردنی ژەهر لەلەشدا**

جگەر لە ماوەی بەرهەمهێنانی ئەنزیمەکاندا، خوێن لە ژەهری ناوی، خاوێن دەکاتەوەو نایهێڵێت، زەردەچەوە کار لەســـەر زیاد بەرهەمهێنانی ئـــەو ئەنزیمانـــە دەکات، کـــە دەبێتە هـــۆی کەمکردنـــەوەی ژەهری ناو لـــەش، هەروەها ســـەلمێنراوە زەردەچـــەوە ڕۆڵێکی گـــەورەی لە ڕێگری نەخۆشییەکانی جگەرو چالاککردنو باشکردنی سووڕی خوێن هەیە.

**چوارەم- ڕێگری لە نەخۆشیی زەهایمەر دەکات**

زەردەچـــەوە ڕێگری لە تووشـــبوون، یان هێـــواشو کەمکردنەوەی گەشـــەی تووشـــبوون بە زەهایمەر دەکات، لەڕێی لابردنی کۆبوونەوەی نیشتووەکانی مێشك، کە دەبێتە هۆی زەهایمەر، لەگەڵ ئەوەی نەخۆشیی زەهایمەر، پەیوەندی بە هەوکردنی مێشکەوە هەیە، زەردەچەوەش وەك پێشتر ئاماژەمان پێ دا، دژەهەوکردنی بەهێزو دژەئۆکسێنەری تێدایە، لەبەرئـــەوە بەکارهێنانـــی ڕۆژانەی زەردەچـــەوە، هۆکارێکی چالاکە بۆ ڕێگری لە نەخۆشیی زەهایمەرو باشکردنی بیرەوەری.

زەردەچەوە بەشێوەیەکی گشـــتی، یارمەتیی تەندرووست مانەوەی مێشـــك دەدات لەڕێـــی لابردنی چـــەوری کۆبووەوە لە مێشـــکداو باش گەیاندنی ئۆکسجین بۆی.

**پێنجەم- یارمەتیی کۆنترۆڵکردنی نەخۆشیی شەکرە دەدات..**

بوونی ماددەی دژەئۆکسێنەر لە زەردەچەوەدا، بەچالاکییەوە یارمەتیی کەمکردنەوەی بەرگریی ئەنســـۆلینو کەمکردنەوەی ئاستەکانی ئەنسۆلین لە خوێندا دەکات، ئەمەش ڕۆڵی ڕێگری تووشبوون بە نەخۆشیی شەکرەی جـــۆری دووەم دەکات، هەروەها ڕۆڵی هەیە لە کۆنترۆڵکردنی ئاســـتەکانی گلوکـــۆزو زیادکردنـــی کاریگەریـــی دەرمانـــی بەکارهاتوو بۆ چارەســـەری نەخۆشـــیی شـــەکرە، بەڵام پێویســـتە بە ئاگادارییـــەوە بخورێت؛ چونکە خواردنـــی زەردەچەوە، لەگەڵ دەرمانێکی بەهێزی نەخۆشـــیی شـــەکرەدا، دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی شەکری خوێن، بۆیە پێویستە پێش خواردنی کەپسوولی زەردەچەوە، ڕاوێژ بە پزیشکی تایبەت بکرێت.

**شەشەم- ئاستی کۆلیسترۆڵ لەخوێندا کەم دەکاتەوە**

تەنهـــا بەکارهێنانی زەردەچـــەوە، وەك بەهارات لەنـــاو خواردندا، توانای کەمکردنەوەی ئاستەکانی کۆلیسترۆڵی ناو خوێنی هەیە، ئەوەش دەزانین بەرزبوونەوەی ئاســـتی کۆلیسترۆڵی ناو خوێن، زۆرجار دەبێتە هۆی کێشەی تەندرووستیی دڵ، بۆیە خۆپاراستن لە بەرزبوونەوەی ئەو ئاستە، ڕێگرە لە ڕوودانی نەخۆشیی دڵو موولوولەکانی خوێن.

**حەوتەم- یارمەتیی دابەزاندنی کێشو سووتاندنی چەوری دەدات**

چەنـــد توێژینەوەیـــەك بـــاس لـــە گرنگیـــی زەردەچـــەوە دەکات، یارمەتیی دابەزاندنی کێش دەدات لەگەڵ نەهێشـــتنی هەڵئاوسانی سك بەهۆی غازاتەوە، یارمەتیی هەرســـکردنی چەوریو کرداری میتاپۆلیزم دەدات، هەروەها بەسوودە بۆ چارەسەری زۆربەی جۆرەکانی هەوکردنی ڕیخۆڵەکان، بەتایبەتی هەوکردنی کۆڵۆن.

**هەشتەم- لە جوانکاریی پێستدا بەکار دەهێنرێت:**

زەردەچەوە بۆ چارەســـەری کێشەکانی پێســـت بەسوودە، بەتایبەتی بۆ زیپکەو برینو ئاسەواری سووتانی پێستو چرچولۆچی پێستو وشکبوونەوەو قڵیشی پاژنەو کەمکردنەوەی مووی لەش بەکار دێتو چارەسەری دەکات.

www. webteb. com
www. rjeem. com
arabic-media. com/articles/id



مۆمی ٤٢

# نیشتمانپەروەری: پەیوەستبوونو بەخشینە

و: ئاسیا سەلاح

## بۆ کوڕو کچە لاوەکانم

مانەوەو نیشتەجێبوون لە وڵاتی خۆتدا، هەستکردن بە ئاسایشو ژیان بەسەربردن لەگەڵ کەسوکارو خزمانو هاوڕێیانی منداڵیدا، یەکێکە لە چاکترین نیعمەتەکان، کە شایستەی ستایشو سوپاسگوزاریکردنی خودای گەورەیە، کەس هێندەی ئەوانەی کە لە وڵاتی خۆیان دەربەدەربوونو لە خێوەتەکاندا ژیاونو دەژین، هەست بەم نیعمەتە گەورەیە ناکەن، کە لەو دەربەدەرییەدا تامی نەنگی دەکەنو چاوەڕێی دەستێکی بەخشندەن، پارووێەك بخاتە ناو قاپی خواردنەکەیانەوە! کاتێك مسوڵمان وڵاتەکەی خۆی خۆش دەوێتو پەیوەستی دەبێت، لە پێناو خێرو خۆشی خاكو خەڵکەکەیدا تێدەکۆشێت، لە ڕاستیدا، ڕێگای پەروەردەکردنی دەروونی خۆی گرتۆتە بەرو لەو خۆپەرستییە قێزەونە ڕزگاری دەکات، کە تێکەڵاوی بووە؛ چونکە خۆشەویستیو دڵسۆزیو گرنگیپێدان، بەخشینێکن لە هەرە بەخشینە جوانەکانن لە مرۆڤدا.

هەموو جموجووڵو چالاکییەکی ئەرێنیو هەموو بەشداریکردنێکی چاکخوازانە، دەبێتە مایەی بەرزکردنەوەی پێگەی وڵاتو پێدانی بەهایەکی زیاترە بۆ کۆی هەموو هاونیشتمانیانی، هەموو ئەمانەش، خەڵکی هەستی پێ ناکەن، هەتا لە وڵاتەکەی خۆیان نەچنە دەرەوە، کاتێك لە فڕۆکەخانەو بوارەکانی کارکردنو لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندندا، بەپێی پاسپۆرتەکانیان مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، لەو کاتەدا هەموو هاوڵاتییەك وەها دەردەکەوێت، کە نموونەیەکی بچووککراوەی وڵاتەکەی خۆی بێت،

هیچ کات، گەورە پیاوان، وەجاخزادەکانو بەخشندەکان، زێدی خۆیان لەبیر ناکەن، هەر چەند پایەدار بنو پێگەیان بەرز بێتەوە؛ چونکە تامەزرۆبوون بۆ نیشتمان، بەشێکە لە گەورەییو وەفاداریو جوامێریان...

دەگێڕنەوە ئەبانی کوڕی عاص، لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، پەیامبەر ﷺ لێی پرسی، مەککە چۆن بوو؟ ئەویش گوتی: گیالیمۆکەی نمای کردووەو هەرزنەکەشی گەڵای گرتووە، ئەوانە ڕوەکی مەککەن لە وەرزی بەهاردا، ئیدی هەردوو چاوی پێغەمبەر ﷺ، پڕ بوون، کاتێك شوێنی لاوێتیو یاریگای منداڵی بیر کەوتەوە...

خۆشەویستیی مسوڵمان بۆ نیشتمانەکەی، بەشێکە لە خۆشەویستی بۆ ئاینەکەی؛ چونکە ناتوانین دین نەشونما پێ بکەین، لە وڵاتێکی شکستخواردوو پەشێودا، یاخود ژێردەستەو دوا کەوتوودا. ئەگەر بمانەوێت، نەتەوەی ئیسلام گەشە بکاتو ئاڵاکەی لە خێروخۆشیدا بشەکێتەوە، دەبێت دەست بکەین بە بنیاتنانی وڵاتێکی شکۆدارو پارێزراوو پڕخێر، کە سۆزو چاکەو تەبایی لەخۆ گرتبێتو خۆشگوزەرانیو ئاسایشو سەقامگیری لە ئامێزدا بێت.

وریابن ڕۆڵەکانم، نەکەن بەوێنەی بازرگانەکان، مامەڵە لەگەڵ نیشتمان دا بکەن، بڵێن: چەندم پێ دەدەیت؟ کاڵاکەم بایی لەوە گرانتر دەهێنێت... ئەم لۆجیکە لەگەڵ خۆشەویستیی ڕاستەقینەی نیشتماندا یەك ناگرێتەوە، جگە لەوەش ئەوەمان لەبیر بێت، کە هەر شتێك پێشکەشی نیشتمان بکەین، وەك قەرزێك وایە لە ئەستۆماندا، وەك شاعیری بەناوبانگ ئەحمەد شەوقی دەڵێت:

بۆ نیشتمانی دایك هەموان لەگەردنمانە بەمەردی بێینە سەنگەر
تا بەخوێن قەرز بدەینەوە بە خاکێك، ئازادیی بەخشی لە بەرامبەر

هەرگیز مەڵێ: ئەم نیشتمانە چی بەمن بەخشی، بەڵکو بڵێ: من چیم پێشکەش بە نیشتمان کرد؟

وڵاتی ئاوەدان، ئەو وڵاتەیە، کە هاوڵاتیی باشی تێدایە، وڵاتی وێرانەش، ئەو وڵاتەیە کە خەڵکی گەندەڵی تێدا دەژی. لێرەدا لەوانەیە بڵێین: هاوڵاتیی باش کێیە؟ هاونیشتمانێتی باش چییە؟ بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەش دەڵێم:

هاوڵاتیو هاونیشتمانێتی باش، خۆی لە ئەو کەسێتییەدا دەبینێتەوە، کە دەتوانێت بەشێك لە خۆشەویستیو سۆزو گرنگیدان بە نیشتمانەکەی ببەخشێت، ئەمەش هانی دەدات کە خزمەتی بکاتو پەرۆشی بۆی هەبێتو پارێزگاری لێ بکات.

هاوڵاتیی باش، بەر لە هەموو شتێك، ئەو خشتە نایابەیە، کە وەستای کارامە شانازی پێوە دەکات بەکاری بهێنێتو بیکات بە بەشێکی بچووك لە بنیاتنانەوەی نیشتمانی گەورە.

شیاویو چاکیی مرۆڤ، لە دوو خاڵی بنچینەییدا خۆی دەبینێتەوە؛ تا ببێت بە بەشێك لە بونیادی وڵاتەکەی، ئەوانیش ڕاستڕۆییو لێهاتوویی کەسییە؛ چونکە ئێمە هەوڵ دەدەین، وڵاتێك بنیات بنێین، کە ڕاستڕۆ، ڕەوشتبەرز، بەرهەمهێن، پتەوو سەربەخۆ بێت.

هاوڵاتیی باش، سەربەستی خۆی گرێ دەدات بە ویستی بەکۆمەڵی کۆمەڵگاکەیەوە، بەجۆرێك کە پابەندی نەریتە پەسەندەکانی دەبێتو هەوڵ دەدات پەیوەندییە ناوخۆییەکانی بەهێز بکات.

هاوڵاتیی باش، دەبێتە سەربازێك بۆ وڵاتەکەی، لەڕێگەی ئەو خۆسازکردنە باشەی خودی خۆیو هەروەها بەهۆی ئەو بەجێهێنانە دەر ئاسایەی لە کارەکانی دا دەیکات بە کارامەییەوە.

کاتێك وڵات لە دەست کێشەو تەنگو چەڵەمە دەناڵێنێت، ئیدی هاوڵاتیی باش دەبێت بە بەشێك لە چارەسەر بۆ ئەو کێشانە؛ چونکە نابێتە بار بەسەر وڵاتەکەیەوە، بەڵکو بە چاوی فریادڕەس لێی دەڕوانن بۆ ڕزگارکردنی لەکێشەکان، ئاشکرایە کە ئەم هەڵوێستەش بەدی نایەت، هەتا ئەو هاوڵاتییە باشو ڕاست ڕۆو چاکخوازو بەرهەم هێن نەبێت.

هاوڵاتیی باش، بڕێك لە کات، یاخود وزە، یان پارەی زیادەی هەیە، هەوڵ دەدات ئەو زیادەیە لە پێناو کەسە بێهێزو کەم داهاتەکانی وەك بێوەژنەکان، بێباوکان، بەساڵاچووانو کەمئەندامانندا بەکار بهێنێت.

هاوڵاتیی باش، وەها مامەڵە لەگەڵ وڵاتەکەیدا دەکات، وەك چۆن ڕۆشنبیرێکی ناوازە مامەڵە لەگەڵ کتێبخانەکەیدا دەکات، بە جۆرێك کە سوودی لێ دەبینێتو هەمیشە پەرتووکی تازەو بەسوودی بۆ دابین دەکات، کاتێکیش بەجێی دەهێڵێت، بە شێوەیەك بەجێی دێڵێت کە لە پێشتر تەواوترو دەوڵەمەندترە بەسەرچاوە.

زیانبەخشترین شت بۆ نیشتمان، ئەو کەسانەن کە باس لە شکۆی وڵاتەکەیان دەکەنو پیای هەڵدەدەن، لەکاتێکدا کار لەسەر زیان پێگەیشتنو زڕاندنی نازناوی دەکەن، منیش پەنا دەگرم بە خودا کە ئێوە لەو جۆرە کەسانە بن.

# ئەمە یاسایە

و: چیمەن لەتیف

دەگێڕنەوە: دووئەسپ بارەبەریان پێدەکرا، یەکەمیان لە پێشەوە ڕێیدەکردو بەگورجوگۆڵی بارەکەی دەگەیاندە شوێنی مەبەست، بەڵام ئەویتریان کە لە دواوە دەڕۆیشت "زۆر سست بوو" بۆیە ئەو پیاوانەی بارەکەیان لێ باردەکردن، بارەکەیان لەسەر پشتی ئەسپی یەکەم دەنا، دوای ئەوەی کارەکەیان تەواو بوو، ئەسپە تەوەزەلەکە هەستی کرد کارەکە بەجوانی تەواو بووە، بە مەستییەوە بە ئەسپی یەکەمی گوت: کۆشش بکەو ماندووبە، تەنها هیلاکیت پێ دەبڕێت!!

کاتێك گەیشتن، مەبەستەکەیان هاتەدی، خاوەنی ئەسپەکان گوتی: بۆچی هەردوو ئەسپەکە ئالیك بدەین، لە کاتێکدا تەنها یەکێکیان بارەبەری کردووە، باشتر وایە گشت ئالیکەکە بدەین، بە یەکێکیانو ئەویتریان سەربڕین، خۆ پێستەکەی بە کەڵکمان دێت، هەروایشیان کرد.

ئەسپە زیرەکەکە واگومانی دەبرد" هەندێ کەس زیرەکی بە هەلاکەت دەزانن" ژیان بە ساختەکاری دەچێتەسەر، دەبێت قازانج بە یەکسانی بەسەر هەمووواندا دابەش بکرێت، چالاکو کارنەکەر.

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە، ئەم چیرۆکە لە ژیاندا زۆرجار دووبارە دەبێتەوە، زۆرجارو لەژێر بارودۆخێکی گەندەڵدا، مرۆ واگومان دەبات، کە فێڵبازەکان دەست بەسەر ژیاندا دەگرن. کەسە لێهاتووەکان یاسای ئەو یارییە دادەنێن.

زۆرێك لە بەدبەختەکان، هەست ناکەن کە ژیان یاسایە، تێناپەڕێنرێت. واتە: باز نادرێت بەسەریدا، ئەگەر لەبەر بارودۆخێك، بۆ ماوەیەکیش لێڵ بێت، وەك چۆن لای ئەسپە تەوەزەلەکە ناڕۆشن بوو، دواتر بەوبارودۆخە لەخۆی بایی بوو.

لە خۆشبەختیماندا قورئان بۆمان باس دەکات کە لە ژیاندا یاسایەك هەیە یاسای کارکردنە ﴿ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ ﴾ التوبة: ١٠٥، بە ئاشکرا قابیلی ژاوەژاو نییە، خودا (هەمیشە ناوی بەرز ڕاگیراوە)، لە ژیاندا پوختەی یاسایەکی گرنگمان دەخاتە بەردەست، یاساکە بریتییە لە کارو هەوڵو تێکۆشان، لە دوارۆژدا لەڕێی هەوڵو تێکۆشانەوە، مرۆڤەکان هەڵدەسەنگێندرێن، بەسەر دنیادا.

یاسای هۆکارو ئەنجام، کردارو پەرچەکردارە، هەروەها یاسای (کارما)ی ڕۆشنبیری هندی، هەموویان جەخت دەکەنەوە کە ئەنجامە دیارو ئاشکراکان، دەرهاویشتەی کردەوەکانن، یاساکانی ژیان، بەسەر گەورەو بچووکدا جێبەجێ دەبێت.

ئایا وەك من تاقیت کردۆتەوە، کە کەسانێك لە تۆ کەمتربوونو سەرکەوتن، لە تۆ نەزانتربوونو قازانجیان کرد، لە تۆ منداڵتربوون، لەژیاندا زۆریان برد، بە بەراورد بەو کەسانەی بەر لەوان پایان بە زەویدا کوتا؟؟!!

دڵتەنگ مەبە، پەروەردگار بە ئەندازەی گەردێك ستەم ناکات، کارو کۆشش بکە، لە کۆتایی ڕێگادا، پاداشتی ئەو کەسانە بدەرەوە، کە شایانی پاداشتن، سکاڵا مەکە، لەوانەیە ئەم کەسە، یان ئەومەردمە شایانی ئەو نیعمەتە بێت کە هەیەتی، لەوانەیە بێئەوەی بە خۆی بزانێت، وەك ئەو ئەسپەی باسکرا ببێتە مایەی تیاچوونی!





هەڵسەنگاندن

# کەسێکی ڕاڕایت، یان ئارامو لەسەرخۆیت؟

١- ئایا لە کاتی تووڕەیدا، ئاژاوەو دەنگەدەنگ درووست دەکەیت؟

أ- زۆرجار، هەندێجاریش زۆر شپرز تووڕە دەبم.

ب- هەندێجار، هەندێك شت بێزارم دەکەن.

ج- بە پێی کات، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی زۆر بێزار نابم.

٢- ئایا هیچ ڕۆژێك هەستت کردووە، کە ناتوانیت سەرخەوێك بشکێنیت، بەهۆی زۆریی کاروبارەکانتەوە؟

أ- بەڵێ زۆرجار. ب- هەندێجار. ج- بەدەگمەن، یان هەندێجار.

٣- ئایا زۆر کات هەستت بە ئازاری ویژدان کردووە، بەهۆی ئەو تاوانانەوە کە ئەنجامت داون؟

أ- هەرگیز. ب- هەندێجار. ج- بەدەگمەن.

٤- ئایا زیاتر لە پێویست بەرگەی کاروبارەکان دەگریت؟

أ- زۆرجار ب- هەندێجار. ج- هەندێجار، بەڵام بەزۆری نا.

٥- ئایا هیچ ڕۆژێك لە خەو هەستاوی، بیرۆکەیەك، یان شتێك نیگەرانی کردبیت؟

أ- بەڵێ. ب- هەندێجار. ج- زۆر بەدەگمەن.

٦- ئایا زۆرجار بە ڕاکشانەوە سەیری بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان دەکەیت؟

أ- کەمتر لە جارێك لە هەفتەیەکدا.

ب- لانی کەم هەفتەی جارێك. ج- هەفتانە زیاتر لە جارێك.

٧- ئایا لە کاتی پشوودا بەتەواوی لە کارەکەت دوور دەکەویتەوە؟

أ-نەخێر؛ چونکە من زۆر سەرقاڵم، بەشێوەیەك کە ناتوانم لە کارەکەم دوورکەومەوە. ب- هەوڵ دەدەم، بەڵام بەردەوام لە مێشکمدا دەمێنێتەوە. ج- بەڵێ.

٨- ئایا بەشێوەیەکی گشتی بە چارەنووست ڕازی لەم ژیانە؟ أ- لە ڕاستیدا نەخێر ب- پێویستە ڕازی بم، بەڵام دەکرا باشتر بوایە ژیانم. ج- بەڵێ.

٩- ئایا دەچیتە نێو حەوزێکی ئاوی گەرم بەمەبەستی پشوودان؟

أ- نەخێر، تەنها خۆم دەشۆرم بەمەبەستی پاك بوونەوە. ب- هەندێجار.

ج- ئەوە ڕێگەیەکی باشە بۆ پشوودان.

١٠- ئەگەر هەستت بە سەرئێشە کرد، یان ئازارێك کە یەکەمجار بوو، ئەو ئازارەت هەبێت، ئایا بە خەیاڵتدا دێت کە ئەوە شتێکی ترسناکە؟

أ- بەڵێ، دوودڵو نیگەران دەبم، ئەو کاتەی ئازارەکە دەڕوات ب- هەندێجار. ج- نەخێر، بەڵام ئەگەر ئازارەکە بەردەوام بوو؛ ئەوا سەردانی پزیشك دەکەم بە مەبەستی ڕاوێژکردن.

١١- ئایا هەوڵ دەدەیت کەمترین کاتژمێر لەشەودا بخەویت؟

أ- نەخێر؛ چونکە من زۆر سەرقاڵم، بەشێوەیەکی گشتی کاتژمێرەکانی نووستنم ڕێژەیین. ب- هەوڵ دەدەم، بەڵام هەمیشە سەرکەوتوو نابم. ج- بەڵێ، هەوڵ دەدەم کاتژمێری پێویست لەشەودا بخەوم، بۆئەوەی بۆ ڕۆژی دواتر چالاك بم.

١٢- ئەگەر ڕۆژێك بڕیارت دا، لەبری چوونە سەر کارو ئەنجامدانی کاروبارەکانی ڕۆژانەت، سەیری یارییەکی ڕاستەوخۆی پاڵەوانێتی کاسەی جیهانی تۆپی پێ بکەیت، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر کار هەبوو، کە دەبوا بە ئەنجامت بگەیاندنایە ئەو ڕۆژە، ئایا هەست بە تاوان دەکەیت، لەبەرئەوەی سەیری یاریت کردووەو کارەکانت ئەنجام نەداوە؟

أ- بەڵێ، تا ڕادەیەك، هاوکات ئەم هەستەم وا دەکات چێژی ئەوتۆ لە بینینی یارییەکە نەبینم. ب- هەست بە کەمێك تاوان دەکەم، بەڵام شایستەی پشوودانم، لە ڕاستیدا من دەزانم کە دەتوانم لە ڕۆژانی دواتردا قەرەبووی کارەکانم بکەمەوە.

ج- نەخێر، هەرگیز هەست بە تاوان ناکەم.

١٣- ئایا بیرت لە مۆڵەتوەرگرتن کردۆتەوە لە کارەکەت، لە پێناوی وەرگرتنی چارەسەر، بۆ نموونە؛ وەکو دەرزی ئاژنینی چینی، یان چارەسەری فیزیایی؟

أ بەڵێ. ب- نەخێر، بەڵام بە نیازم لە داهاتوودا بیری لێ بکەمەوە.

ج- نەخێر.

١٤-ئایا لەسەرقاڵیتدا نینۆکەکانت دەخۆیت؟

أ- بەڵێ. ب- هەندێجار. ج- نەخێر.

١٥- ئایا دەبینیت کە هەندێجار هانی خۆت بدەیت، تا زیاتر لە خێرایی ئاسایی خۆت بڕۆیت؟

أ- بەڵێ، زۆرجار. ب- هەندێجار. ج- بەزۆری نا.

١٦- ئایا هەست بە هەناسە سواری دەکەیت، لە کاتێکدا تۆ لە ژێر کاریگەریی پاڵەپەستۆو دڵەڕاوکێ دایت؟

أ- بەڵێ. ب- ئەوە ڕوویداوە بەڵام زۆر بەدەگمەن.

ج- هەرگیز تێبینی لەو شێوەیەم نەکردووە.

١٧- ئایا کاروبارە زۆروزەوەندەکانت دەبنە هۆی ئەوەی زۆر لە خۆت بکەیت، وەکو ئەوەی بەردەوام کار بکەیت تا نزیکی کۆتایی هاتنی کارەکەت؟

أ- بەڵێ. ب- بە هەمیشەیی نا، هەندێك كات. ج- نەخێر.

١٨- چۆن بەراوردی خۆت، بە کەسێکی ئاسایی دەکەیت، لە ڕووی پێکەنینو زەردەخەنەوە؟

أ - کەمتر لەو جۆرەم. ب- بە نزیکەیی یەکسانین.

ب- زۆر لەو جۆرەم..

١٩- ئایا هیچ کات ڕووی داوە کارێك بۆ چەند ڕۆژێك لە مێشکتدا بمێنێتەوەو خول بخوات؟

أ- زۆرجار. ب- هەندێجار. ب- زۆر بەدەگمەن، یان هەر نەبووە.

٢٠- ئایا تۆ گەشبینی بەرامبەر ئایندەت؟

أ- بەشێوەیەکی تایبەت نەخێر، لەبەرئەوەی من نیگەرانو ڕاڕام بەرامبەر بە ئایندەم. ج-من نە گەشبینم بە ئایندەم نە ڕەشبینم، لەبەرئەوەی ئەوەی ببێت دەبێت.

ج- بەڵێ من گەشبینم.

٢١- ئایا لەو باوەڕەدایت پیادەکردنی هونەری یۆگا، سوودی هەبێت؟

أ- بە بڕوای من ئەو هونەرە بیرۆکەیەکی باشە، ئەگەر کاتم هەبێو بتوانم ئارام بگرم لەگەڵیدا. ب-ئەو هونەرە بۆچی؟

ج- نەخێر پێویست نییە.

٢٢- ئایا کەس داوای لێکردوویت، کە زیاتر پشوو بدەیت؟

أ- بەڵێ چەندجارێك. ب- بەڵێ، هەندێجار. ج- نەخێر.

٢٣- ئایا هیچ کات بووە هەستت بە نەخۆشییەك کردبێتو پشکنینت کردبێت، ئەنجامەکەی گوشارو پاڵەپەستۆ بووبێت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر، بەڵام ئەو حاڵەتە ڕوو دەدات. ج- نەخێر.

٢٤- ئایا گوشاری دەرەکی، کاریگەری کردووەتە سەر ژیانی هاوسەرداریت؟

أ- زیاتر لە جارێك. ب- هەندێجار. ج- هەرگیز.

٢٥- چەند جار لە ژیانتدا، هەستت بەسووربوونەوەو شەرمەزاری کردووە؛ لەبەرئەوەی بێزاربوویت زیاتر شڵەژاویت؟

أ- زۆربەی جار. ب- هەندێجار. ج- بەدەگمەن.

ئەنجام:

بۆ وەڵامی (أ) دوو خاڵ دابنێ، بۆ وەڵامی (ب) یەك خاڵ، بۆ وەڵامی (ج) سفر دابنێ.

تێبینی: ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان: (٤٠-٥٠) بوو:

مانای وایە تۆ خاوەنی سرووشتێکی زۆر هەستیاریت، لەگەڵ ئارەزووت بۆ پارێزگاریکردن لە زۆرێك لە بیرۆکەکانی ناو مێشکت، بە هۆی سرووشتی مامەڵەت لەگەڵ کاروبارەکانو ڕووبەڕووبوونەوەی گوشار، ئاستەمە بتوانیت ئاسوودە بیت، بەڵکو کەسێکی ڕاڕاو نیگەران دەردەکەویت.

بێگومان خاڵی چڕکردنەوەت لەسەر دوودڵیو نیگەرانیت، هۆکارە بۆ بەرزبوونەوەی گوشارو پاڵەپەستۆت، کە سەرەنجام دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێك نەخۆشی، لەبەرئەوە هەوڵ بدە، بەپێی توانا پشوو بدەو ئاسوودە بە، هەمیشە بیر بکەرەوە، کە تۆ چەقی گەردوون نیت، هاوکات هیچ کێشەیەك نییە، ئەگەر بەپێی بارودۆخو کات، هەندێجار هەڵوێستەیەك بکەیتو کەمێك بگەڕێیتەوە بۆ دواوەو زیاتر بیر لە خۆت بکەیتەوە، لە ڕاستیدا تۆ مەیلت هەیە بە هەستێکی ئاشتیانە لە ناختدا، هەروەها ئاشتی لەگەڵ تەواوی جیهانی چواردەورت، لە کۆتاییدا دەبینیت کە ژیان، زیاتر لەوەی پێبەخشیویت، کە چاوەڕێت دەکرد.

بەڵام پێویستە خۆت لە ڕۆتینی ڕۆژانەی ژیانت دوور بخەیتەوە، هەوڵ بدە پشووی تەواو بدەیت، بۆ چەند ڕۆژێك، دەتوانیت بڕۆیت بۆ پارکێکی خۆشو کەمێك بەئارامی دابنیشیت، بەڵام هەرگیز بەهەڵچوونەوە، مەگەڕێرەوە سەر کارە سەختو قورسەکەت دوای ئەم پشوودانە، بەڵکو هەندێك لە کاتەکانت لە کارێکدا بەسەر ببە، کە حەزی پێ دەکەیت، بۆ نموونە: پیاسەکردن، سەردانو گەڕان، یان یارییەکی خۆش، یان خۆسەرقاڵکردن بە کاری گوڵو گوڵزارو باخدارییەوە، ئەم جۆرە کارانە یارمەتیت دەدەن، کە ئاسایی ببیتەوەو ماندووبوون لە جەستەت بڕەوێننەوە، ئەگەر بەم شێوەیەت کرد؛ ئەوا بۆ ڕۆژی دواتر بە هەستێکی خۆشو چالاکییەکی زیاترەوە دەچیتەوە سەر کارەکەت.

- ئەگەر خاڵەکانت لە نێوان: ٢٥-٣٩ خاڵ بوو:

مانای وایە هەرچەندە تۆ دەبینیت، کە گوشاری دەرکیو پاڵپەستۆی کارەکەت هەندێك کاریگەری لەسەر ژیانت درووست کردووە، بەڵام ئەم کاریگەرییە حاڵەتێکی جیاوازە لەوەی تۆ هەمیشە تێبینی بە دەروونی خۆت بدەیتو ئاماژەی شتە خراپو ترسناکەکان بکەیت، کە هەوڵ دەدەیت زیاتر خۆتیان لێ دوور بخەیتەوەو لەسەر شانی خۆت سووکیان بکەیت.

ئەگەر خاڵەکانت لە ٢٥ خاڵ کەمتر بوو:

ئەوا تۆ کەسێکی لەو کەسانەی کە خاوەنی هەستو چارەنووسێکی زۆر باشنو گرنگی بە پشوودانو حەوانەوەی خۆیان دەدەن، تۆش وەکو زۆرێك لەخەڵکی هەندێك جار نیگەران دەبیت، بەڵام هەمیشە هەوڵی کەمکردنەوەی ئەو ماوە نیگەرانییە دەدەیت، تۆ لەو بڕوایەدایت کە زۆربەی ئەو شتانەی دەبنە هۆی نیگەرانی خەڵکی، هەرگیز ڕوونادەن؛ لەبەرئەوە بۆ هەندێك کاروبار پێویست بە نیگەرانی ناکات، مەگەر ئەو کارە ڕوویدات کە تۆ نیگەرانی بوویت، ئەوەش حاڵەتێکی دەگمەنو ناوازەیە، تەنها وشەیەك کە پێویستە هەر یەك لە ئێمە ئاگاداری بێت، بریتییە لە کەمکردنەوەیو لە هەندێك بارودۆخدا وریاتر بینو بە ئاسوودەیی پشوو بدەین، بە گشتی باشتر وایە پشوودان نەبێتە هاندەرت؛ بۆئەوەی بگەیتە پلەیەکی ساویلکەیی.

# وەڵامی بەجێ

نووسەرێکی لەخۆبایی بە بەرنادشۆی گوت: من باشترم لە تۆ؛ چونکە تۆ لە پێناوی سەروەتو ساماندا دەنووسیت! بەڵام من لە پێناوی شەرەفو کەرامەتدا دەنووسم..

بەرنادشۆ گوتی: ڕاست دەکەیت، هەر یەکەمان بۆ بەدەستهێنانی شتێک دەگەڕێینو تێدەکۆشین، کە نیمانە.

---

سەعدی شیرازی دەڵێت: شەوێکیان لەگەڵ باوکمدا هەستام بۆ شەونوێژکردن، سەرنجم دا تەنها ماڵی ئێمە ڕووناکە.. گوتم: بابەگیان، خۆزگە ئەم خەڵکەش هەڵدەستان بۆ شەونوێژ، بڕوانە چۆن هەموویان، وەکوو مردوو پاڵ کەوتوونو هەڵناسنەوە.

باوکم پێی گوتم: کوڕی خۆم، خۆزگە تۆش بخەوتیتایە، نەک غەیبەتی خەڵکیت بکردایە!

---

کوڕ: بابەگیان دەکرێت کەسێک لە ڕووبارێکدا مەلە بکاتو لە تینوێتیشدا بخنکێت؟

باوک: بەڵێ ڕۆڵەگیان.. من گەلێکم دیوە، لە نەوتدا مەلە دەکەنو بەهەژاریش سەر دەنێنەوە!

---

لە دانایەکیان پرسی: بۆچی لەگەڵ کەسێکدا، کە خراپەی لە بەرامبەردا کردوویت، تۆ بە چاکە وەڵامی دەدەیتەوە؟

ئەویش گوتی: چونکە بە چاکە، ژیانی ئەو کەسە باشتر دەکەم، ڕۆژی خۆم جوانتر دەکەم، بیروباوەڕم بەهێزتر دەبێت، ڕۆحم خاوێنترو دەروونم پاڵفتەتر دەبێت!

---

جارێک لە دانایەکیان پرسی: جوانترین شتێک کە دیوتە چییە؟

گوتی: لەو کەسە جوانترم نەدیوە، کە سەرجەم کەموکوڕییەکانی دیومو هێشتاش خۆشیدەوێم!

هەڵەکانی ڕابوردوو لەیاد بکە، شکستەکان لەیاد بکە، هەموو شتێک لەیادبکە
جگە لەوەی کە ئێستا پێویستە چی بکەیت، پاشان ئەو کارەبکە!

ویــل دیورانــت- مێژوونووس

لەم ڕۆژگارەدا، مرۆڤ دەتوانێ لە هەموو شتێک ڕزگاری ببێت جگە لە مردن..
دەتوانێ قەرەبووی هەموو شتێک بکاتەوە کە لە دەستی داوە، جگە لە ناوبانگی باش!

ئۆســکار وایڵــد – نووســەر

مرۆڤی دەوڵەمەند، تەنها مرۆڤێکی هەژارە، بەڵام پارەی پێیە!

دبلیو سی مێلوز- ئەکتەری کۆمیدی

خەو ببینە، خەو ببینە، پاشان ڕاپەڕە بۆ بەدیهێنانی خەونەکەت!

-دیزموند توتو- پیاوی ئایینی

خۆت بپارێزە لەو کەسانەی کە بۆ هەموو کارێک، دەڵێن: بەڵێ باش؛ چونکە
ئەوانە کەسانێکی دۆڕاون لە ژیاندا.

بیر برایانت- ڕاهێنەری تۆپی پێ

# گۆرانی بەڵێ بۆ ژیان



# 10 زیرەکترین کەسایەتییەکانی جیهان

## 6 غاری کاسباروڤ

نارین جووتیار

کەسانێك هەن بلیمەتیان بەڕادەیەکە، ئەستەمە بتوانیت پێوانەو شیکردنەوەی بۆ بکەیت، هەمیشە لە لوتکەی سەرکەوتندا، بەدیار دەکەون؛ بەهۆی هێزی پێشبینیکردنو خستنەگەڕی تواناکانیان، غاری سیاسەتمەدارێکی ڕووسیو چالاکوانی جیهانی بۆ مافی مرۆڤو نووسەرو پاڵەوانی پێشووی شەترەنجە، ئاستی زیرەکی ١٩٠ ـە بە پێی پێوانەی جیهانی.

لە شاری باکۆ لە ئازەربایجان لە ١٣ی نیسانی ١٩٦٣ لەدایك بووە، ناوی تەواوی غاری وینستۆن ـە بەڵام گۆڕیویەتی بۆ کاسباروڤ تا نزیکتر بێت لە ناوی ڕوسییەکانەوە، لە تەمەنی پێنج ساڵیدا، توانیویەتی بەئاسانی پارچەکانی شەترەنج بجووڵێنێت، بەمەش باوانی تووشی سەرسامی کردووەو هەواڵەکەی لە ڕۆژنامەیەکی ناوخۆدا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام دوای تێپەڕبوونی دووساڵ، باوکی کۆچی دوایی دەکاتو سەرکەوتنی کوڕە موعجیزە ئاساکەی نابینێت لە مێژووی یاریی شەترەنجدا. بچووکترین پاڵەوانی جیهانی شەترەنج بووە لە مێژوودا.

**ژیانی منداڵی:** کاسباروڤ هەر لە منداڵییەوە حەزی لە خوێندنەوە کردووە، بەتایبەتی کتێبە مێژوویەکانی ڕۆمانی بەریتانیو فەرەنسی، هەروەها زۆر کاریگەر بووە بە کەسایەتیی مێژوویی «ناپلیۆن»و عاشقی جوگرافیا بووە، لەبارەی گەشتەکانی کۆلۆمبسو ماجەلان خوێندوویەتییەوەو شارەزایی پەیدا کردووە لەبارەی زۆربەی وڵاتان، لە قوتابخانەشدا لە وانەی بیرکاریو جەبر زۆر زیرەك بووە، هەربۆیە ماموستاکەی هەمیشە ئامۆژگاریی دایکی کردووە؛ تا لەبواری بیرکاری تایبەتمەندی وەربگرێت؛ بەڵام ڕەتی کردۆتەوەو چووەتە بواری ئەدەبو شیعر.

**ئەزموونی وەرزشی:** لە تەمەنی ١١ ساڵی لە قوتابخانەی «میخائیل بوتفنیك» بووەتە قوتابی ڤلادیمر ماکو غونوفو لە ١٩٧٦و لە تەمەنی ١٣ ساڵی واتە لە ساڵی ١٩٨٠ لە پاڵەوانێتی جیهانی تازەپێگەیشتووان بەژداری کردووەو توانیویەتی پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت، لەهەمان ساڵدا نازناوی ماموستای گەورەی پێ بەخشراوە. هەروەها لە ١٩٩٥ سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەسەر ماموستای هیندی «ئەناند»، بووە خاوەنی بەرزترین پلە لە مێژووی شەترەنج، هەروەها ناوبانگی زیاتر بڵاوبووەوە کاتێك توانی سەرکەوتوو بێت بەسەربەرنامەیەکی کۆمپیوتەری بەناوبانگ «دیب بلو»، غاری ٢٠ ساڵ لە لوتکەی پاڵەوانانی جیهانی بوو لە شەترەنجو ١٣ جار پاڵەوانێتی شەترەنجی بەدەست هێناوە لە ساڵی ٢٠٠٥ وازی لە یاری شەترەنج هێنا.

**شەترەنجو ڕەنگدانەوەی لە ژیانی کاسباروڤ:**

یاریی شەترەنج یەکێکە لەو یارییانەی کە پێویستی بە سەرنجو زیرەکییەکی زۆر هەیەو زۆربەی وڵاتان، پێشبڕکێ بۆ ئەم یارییە ئەنجام دەدەنو یەکێ لە ناوە هەرە دیارەکانو پاڵەوانی ئەم یارییە «غاری کاسباروڤ»ـە کە گرنگییەکی زۆر بەم یارییە دەداتو یەکەم زاناو شارەزای ئەم یارییە یە. ناوبانگی لە هەموو جیهان دەرکرد بەهۆی بەهرەو تیۆرە سەرسووڕهێنەرو شێوازە ناوازەکەی کە هەرگیز لە سەرکەوتن نەوەستاوەو نازناوی «جول باکۆ»ـی بۆ بە شیاو زانراوە.

* لە تەمەنی پێنج ساڵی فێری شەترەنج بووەو لە تەمەنی یازدە ساڵی، لە پاڵەوانێتیی ئازەربایجان سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

* لە ساڵی ١٩٨٠ لە پاڵەوانێتیی جیهانی بۆ تازە پێگەیشتووان سەرکەوتوو بوو.

* هەر لە هەمان ساڵدا نازناوی مامۆستای گەورە نێودەوڵەتی وەرگرتووە.

* لە ١٩٨٤ لە پاڵاوتنی پاڵەوانێتی جیهان بۆ گەورەکان لەگەڵ ئەناتولی کاربوف ٤٨ خولی ئەنجام دا؛ تا سەرۆکی یەکێتییەکە بڕیاری ڕاگرتنی یاری دا، بەهۆی خراپی باری تەندروستی کاربوف.

* لە ساڵی ١٩٨٥ بەسەر ئەناتۆلی کاربۆفدا سەرکەوتو بووە پاڵەوانی جیهان.

* لە ١٩٨٦ دووبارە سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

* لە ١٩٨٧ بەرامبەر بوو لەگەڵ ئەناتۆلیو بە پێی یاساکانی یەکێتیی نێودەوڵەتی، دیسان نازناوەکە بە کاسباڕۆف بەخشرا.

* لە ١٩٩٠ بۆ پێنجەمین جار سەرکەوتنی بە دەست هێناو پارێزگاری لە نازناوەکەی کرد.

* لە ١٩٩٣ یاریزانی بەریتانی نایجل شۆرت، سەرکەوتوو بوو، بەڵام بە بڕیاری یەکێتی، ڕازی نەبوونو لەدەرەوەی یەکێتییەکە دووبارە یارییان کردەوەو کاسباڕۆف سەرکەوتوو بوو.

* لە ١٩٩٥ بەسەر ئەستێرەی هیندی ئەناندو لە ٢٠٠٠ بەسەر ئەستێرەی ڕوسی ڤلادیمر کرامینك سەرکەوتوو بوو.

* خەڵاتی ئۆسکاری ١١ جار وەرگرتووە بۆ شەترەنج.

**شەترەنجو زیرەکی:**

کاسباڕۆف هەوڵی داوە شارەزاییەکەی کۆبکاتەوەو تێڕوانینی بۆ شەترەنج لە پەرتووکێکی گەورە بەناونیشانی «بلیمەتە پێشووەکانی شەترەنج» تۆمار کردووە. هەروەها لە شەترەنجەوە زۆر شتی تر فێربووە، لەوانە چۆنێتیی ڕەخساندنی دەرفەتو پێشبینیکردنی داهاتوو، دانانی ستراتیجیەتی بردنەوە هەموو ئەمانەش دەگەڕێنێتەوە بۆ مامەڵەکردنی لەگەڵ کەسانێکی بەهرەمەندو فێڵبازو بلیمەتو ئامادەکارییەکانیانو بەکارهێنانی گشت هەستەکانیانو پێشبینیکردنی خەیاڵو ئەندێشەکانیان.

کاسباڕۆف دەڵێت: هەمیشە پێشبینی جووڵەی دواتر دەکەم بە چەندەها جۆری جیاواز، لەکاتێکدا شارەزاترینی یاریزان لەو بوارە تەنها دەتوانێ ١٥ جووڵە پێشبینی بکات، بڕیاردان لەوکاتە هەستیارە زۆر قورس دەبێت، پێویستە یاریزان زۆر بەوردی سەرنج بداتو وشیار بێتو هەموو هەستی بەکار بهێنێت. پاشان دەڵێ: لەکاتی یاریکردندا، پلانی هەموو بلیمەتەکان دێنمە بەرچاوەو تێبینی گشت جووڵەکانی کەسی بەرامبەر دەکەم.

بەم شێوەیە توانی ژیانی خۆی بنیات بنێت، لەرێگەی ئەو پێشبڕکێیە ئەفسانەییانەی تێدا سەرکەوتوو بوو بەسەر هەریەك لە «گراند ماستەرو ئەناتۆلی کاربۆف»و ئامێری گەورەی (ئای بی ئێم-دیب بلو) هەروەها ئەزموونی سیاسیو ئەدەبیو وەرزشیو مێژووی سەربازی بەهۆیەوە بەرەو پێش بردو سەرنجی ئەو بۆ شەترەنجو ڕەنگدانەوەی لە ژیانی دا کردوویەتی بە گەورەترین بیرمەندو داهێنەری سەردەمی خۆی.

کاسباڕۆف، جەخت لەسەر سێ بنەمای بنەڕەتی دەکاتەوە، کە پێویستە جێبەجێ بکرێن، لەکاتی یاریکردندا ئەمانیش:

**یەکەم: هەرگیز سووکایەتی بە تواناکانی بەرامبەرەکەت مەکە:**

گەر هەستت کرد، کە جووڵانەوەکانی کەسی بەرامبەر ڕاتدەکێشن بۆ سووکایەتی پێکردنی؛ ئەوا دەستبەجێ پێچەوانە ڕەفتار بکەو دڵنیابە ڕکابەری، هەمیشە سەردەکێشێت بۆ فێڵبازی، بەڵام تۆ وای دابنێ، کە تەنها کارێکە.

**دووەم: هەمیشە لەسەرەتاوە بە سەرکەوتنی دەروونی دەست پێ بکە:**

جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە شکست خواردنەکەی لەبەرامبەر «ڤلادمیر کرامینك «لە ساڵی ٢٠٠٠ ز بەهۆی ئەوەوەبوو کە جووڵانەوەکەی نوێ بوو بۆی، هەربۆیە هاوسەنگی خۆی لەدەست داوەو «هاوسەنگی دەروونی تێکچووە» دەستبەجێ تووشی شکستخواردنی کردووە.

**سێیەم: وەکو ڕکابەرەکەت بیربکەوەو خۆت لە شوێنی ئەو دابنێ:**

لەبەرئەوەی یەکەم هەنگاو بۆ ڕکابەری تێگەیشتنە لە یاریو ئاشکراکردنی خاڵە هاوبەشەکان لەوێوە بۆت دەردەکەوێت کە یاریی شەترەنج، تەنها ڕکابەری بیرکردنەوە نییە، بەڵکو ڕکابەریی دەروونیش دەگرێتەوە، تەنانەت گرنگترە. ئەگەری ئەوە هەیە لەکاتی یاریدا، تووشی نائومێدی ببیت بەهۆی جووڵەی ڕکابەرەکەتو جووڵە لاوازەکانت، بەمەش وەرەت دادەبەزێتو تووشی دۆڕانت دەکات. واتە: شکستخواردن لە شەترەنجدا، لە سەرەتاوە، لەئاستی دەروونییەوە دەست پێدەکات، پێش دۆڕانی فکری.

**ئەزموونی سیاسی:** دوای بردنەوەی لە ٢٠٠٥ لە پاڵەوانێتیی لیناریس بڕیاری یەکجاری دا؛ بۆ دوورکەوتنەوە لە شەترەنجو دەستی بەکاری سیاسی کردو چووە ناو بەرەی ئۆپۆزسیۆنی ڕوسی دژی ڤلادیمیر پۆتینو تاوانباری کرد بە قۆرخکردنی دەسەڵات بە درێژای ژیانیو پابەندنەبوون بە بەڵێنەکەی بۆ باشترکردنی ژیانو کۆتایی هێنان بە جەنگی شیشانو گەیاندنی ڕوسیا بە بارودۆخێکی خراپ. هاوکات بزوتنەوەیەکی سیاسی دامەزراندو هەڵبژێردرا بۆ سەرۆکایەتیکردنی هاوپەیمانی بەرهەڵستکاران دژی حکومەتی ڕوسیا. لە ٢٠١٢ بووە سەرۆکی دامەزراوەی مافی مرۆڤ کە بارەگاکەی لە نیویۆرکە.

دەتوانین بڵێین: لەم ڕۆژگارە خێراو نوێو سەرەڕۆیەدا، ئەو خاوەنی عەقڵێکی باڵایە، لەکاتێکدا کەسانێك هەن، بۆ داهاتوویەکی باشتر هەتا خەیاڵیشیان نییە «ئەوەی ئێستا نرخی ئەو ئازادییە نازانێت، تا پارێزگاری لێ بکات گەر نیوەی ئەو ئازارەیان بکێشایە کەبەهۆیەوە بەدیهاتووە، باشتر پارێزگارییان لێ دەکرد. «بەهەمان شێوە نرخ بۆ سەرکەوتنەکانیشت دانانێن؛ چونکە نازانن چ ئازارێکت کێشاوە، وێناکردنی داهاتوویەکی باشتر، کارێکی هێندە زەحمەت نییە، تەنها کەمێك ئیرادەی پێویستە، نەك بیانوو. چەندەها پرۆژەو پلان هەن، کە پێویستیان بە جێبەجێکردن هەیە، هەنگاوی یەکەمیش بۆ جێبەجێکردنیان دیاریکردنی کێشەکانو سەرکەوتن بەسەر ئاستەنگەکانە.



بەڵین ئەنوەر

# هیواخواز بین، یان خەیاڵپەروەر!؟

هیواکان گەورەترین هۆکاری ژیانو مانەوەی مرۆڤن. خواستو ئارەزووەکانیش، زادەی هیواکانن‌و لەو بازنەیەوە سەرچاوە دەگرن. ئێمەی مرۆڤ دەخولقێنرێین‌و بەردەوامیش خولقێنراوین، ئینجا دەژین‌و سەرجەم قۆناغ‌و ڕێگەو بەشەکانمان، لەم ژیانەدا تەواو دەکەین، پاشان قۆناغێکی دیکە دەبڕین، کە ئەویش پیربوون‌و مردنە. مردنیش گەورەترین ڕازی ئاسمانە لەسەر زەوی، هەتا زەوی بمێنێت، ئەم ڕازە لە خۆیدا هەڵدەگرێت. کەواتە: ئەمە ڕێککەوتنێکی نێوان ئاسمان‌و زەوییەو ئێمەش لەم نێوانەدا، وەکو کەسی سێیەم پشکمان بەر دەکەوێت‌و لەسەر زەوی پرۆسەکان تەواو دەکەین. لە هەموو ئەم کارو بوارانەدا، مرۆڤ چۆن دەتوانێت، لە نێوان ئەم فەرمانە بەهێزو کارو شەپۆلانەدا هەڵبکات‌و بژیو بەرگە بگرێت؟ لە کاتێکدا کە ئەو خاوەنی توانایەکی سنووردارو هێزێکی دیاریکراوو جەستەیەکی فیزیکییە، کە بەرگەی کەمترین بەرکەوتنی ماددی‌و گوشاری دەروونی ناگرێت؟

بەڵێ، ڕاستە کە مرۆڤ خاوەنی ئەم سیفەتە تایبەتی‌و سرووشتە لاوازانەیە، بەڵام ئەو شتەی کە هەتا ئێستا مرۆڤی ڕاگرتووەو نەیهێشتووە کە بە زەوی لەناو بچێت، هێزی ئیمان‌و هیواکانیەتی کە هەمیشە لە ناخیدا نوێ دەبنەوەو لەگەڵ تازە بوونیشیاندا، تازەی دەکەنەوەو مەعنەویاتی ڕادەگرن‌و هێزی کارو گوزارشتی پێ دەبەخشن. هیوا ئەو فاکتەرە سەرەکییەیە کە مرۆڤ لەگەڵیدا دەژی‌و هەندێجار لەگەڵیدا دەمرێت، پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت، بەرەو بەرهەم‌و داهێنانی زیاترو هونەری ناوازەو جوانتر. ئەو دەروونەی کە هیچ هیوایەکی تێدا نییە؛ خاوەنی ژیانێکی سەخت‌و تاڵەو هیچ هۆکارێك پەی پێ نابات کە ئاڕاستەی بکات‌و لۆژیکییانە بیخاتە سەر هێڵی خۆی؛ چونکە ئەو هۆکارەی کە ئەوی ڕاگرتووە، خۆی بە کەمترین هۆکار هەرەس دەهێنێت‌و تێك دەشکێت. بۆیە هەمیشە ئەو مرۆڤانەی کە بێهیوان لە ژیانیاندا وزەیەکی فیکری‌و زەینی زۆر بەهەدەر دەدەن‌و لە ئاکامدا جەستەیەکی لاوازو نەخۆشیان دەبێت. ئەگەر بە تێڕوانینێکی دینیانە «ئیسلامیانە» سەیری ئەم کەسانە بکەین؛ ئەوا نابێت ئەم مرۆڤانە بێهیوا بن، پێویستە هیوا بۆ خۆیان درووست بکەن، ئەویش بەبیرکردنەوەیان لەوەی کە ژیان تەنها تاقیکردنەوەو پێشبڕکێیەکی کاتییەو هیچ شتێك تا سەر بۆ مرۆڤەکان نامێنێتەوە، ئەوەی کە بەردەوام نافەوتێت، ئەو هیوایانەیە کە مرۆڤ هەیبووە، بەو موژدە ئیلاهییانەی کە خودا پێی داوەو مرۆڤیش متمانەی پێ بەخشیوەو خوداش لەبەرامبەردا هیواداری کردووە؛ چونکە هیوا واتە: کارکردن لەو پێناوەدا ئەمەش بەشێکی سەرکەوتن‌و بەختەوەرییە، کە مرۆڤ بە گەشبینی لە ژیاندا دەهێڵێتەوە. هیوا شتێك نییە، کە بەرجەستە بکرێت‌و وەربگیرێت، یان مامەڵەی پێوە بکرێت، هیوا ئاڕاستەکردنی مرۆڤە بەرەو ئەقڵانیەت‌و مانەوە». هیوا ئەزموونی کارە، هیوا بڕیارو ژیانەو ژیانیش بەڵێن‌و ئیمان‌و پێکەوەبوونە بەرەو خزمەت‌و داهێنانی باشتر، کەواتە: مرۆڤی ئیماندار نابێ بێ‌هیوا بێت».



# هەیاسی خاس

هەیاسی خاس سەبارەت بە وەڵامە بەجێو خێراکانی لە کاری دادوەریدا دەڵێت: من نیوەی زیرەکیو ژیریم بەکار دەهێنم بۆ وەڵامەکان، بەڵام ئەگەر زانیم کێشەکە قورسە؛ ئەوا تەواوی زیرەکیو ژیریم بەکار دەهێنم!

بێگومان بیرتیژیو لێهاتوویی هەیاسی خاس، وای کردبوو کە بەو جۆرە سەرکەوتووانە بڕیار بداتو بەو شێوەیە ناوبانگی دادوەرییەکەی، سنوورەکان تێپەڕێنێت!

لە ژمارەی ئەمجارەدا، دووبارە دەچینەوە دادگاو دادوەرییەکەی هەیاسی خاسو باس لە دادوەرییەکی دیکەی ئەو قازییە لێهاتووە دەکەین، هەیاس بە جۆرێك لە دادوەریدا لێهاتوو بووە، کە هیچ کات فێڵبازو دەستبڕەکان نەیانتوانیوە، لەژێر دادوەریی هەیاسدا فێڵێك بکەن؛ تا ماڵی خەڵکی، بەناحەق پێ بخۆن.. چونکە هەیاس هێندە بیرتیژ بووە، کە بۆ هەموو کێشەیەك دەستبەجێ بە وەڵامێکی خێراو بڕیارێکی درووست، مافی بۆ خاوەن ماف گێڕاوەتەوە.

جارێکیان کابرایەك لەگەڵ هاوڕێکەی ڕۆیشتنە دادگاکەی قازیی هەیاسو سکاڵای لە دژی هاوڕێکەی تۆمار کردو گوتی: جەنابی قازی، کیسەیەك پارەم لای ئەم هاوڕێیەم داناوە، ئێستا دوای گەڕانەوەم لە سەفەر، دەمەوێت ئەمانەتەکەم بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام هاوڕێکەم نکوڵی دەکاتو دەڵێت: تۆ هیچ ئەمانەتێکت لای من دانەناوە؟!

قازیی هەیاس: بە سکاڵاکار دەڵێت: ئایا شایەتێکت هەیە، کە شایەتیت بۆ بدات کە تۆ ئەو ئەمانەتەت لای ئەم هاوڕێیەت داناوە؟

سکاڵاکار گوتی: نەخێر جەنابی قازیی، هیچ شایەتێکم نییە!

سکاڵالێکراویش لەبەردەم جەنابی قازی نکوڵی کرد، کە هیچ ئەمانەتێکی لە هاوڕێکەی وەرگرتبێت..

هەیاسی خاس گوتی: باشە لە کوێ ئەمانەتەکەت پێدا؟

سکاڵاکار: لە فڵانە شوێن..

قازیی هەیاس گوتی: چ شتێکی لێبوو ئەو شوێنەی تۆ ئەمانەتەکەت دا بە هاوڕێکەت؟

سکاڵاکار گوتی: قوربان درەختێکی گەورەی لێ بوو، لەژێر ئەو درەختە دانیشتبووین، کە ئەمانەتەکەم پێدا..

هەیاسی بیرتیژو خاوەن ئەزموون بە سکاڵاکاری گوت: هەر ئێستا بڕۆ بۆ ئەو شوێنەو بەوردی دیقەتی درەختەکە بدە، بەڵکو نیشانەیەك، هێمایەك، شتێك بەدی بکەیت، کە ببێتە بەڵگە بۆ سەلماندنی قسەکانت.. هاوکات بە سکاڵالێکراویشی گوت: تۆ لای من دانیشە؛ تا سکاڵاکار دەگەڕێتەوە..

پاشان هەیاس سەرقاڵی بەڕێکردنو داوەریکردنی کێشەی هاوڵاتیانی دیکە بوو، لە پڕ سەیرێکی سکاڵالێکراوەکەی کردو گوتی: ها کابرا تۆ دەڵێیت، ئێستا هاوڕێکەت گەیشتۆتە لای درەختەکە؟

سکاڵالێکراو: وتی نەخێر قوربان.. بەم زوانە ناگات؛ چونکە ئەو شوێنە زۆر دوورە لێرەوە..

بێئاگا لە خۆی، نەیزانی بەو وەڵامەی کەوتۆتە نێو داوی زیرەکی قازیی هەیاسەوە!!!

هەیاسی خاس گوتی: ئەی دوژمنی خودا، تۆ کەسێکی ناپاکیت، تەنانەت لە هاوڕێکەشت ناپاکی دەکەیت!

ئەو کات سکاڵالێکراو ڕاچڵەکیو هاوشێوەی ئەوەی لەخەو بێدار بێتەوە، تێگەیشت کە بەو وەڵامەی دانی ناوە بەوەی کە ئەمانەتی هاوڕێکەی لەلایەو بەڵێ، سکاڵاکار زۆر ڕاست دەکات! بەناچاری ملی ڕێگەی ماڵی گرتەبەرو ئەمانەتەکەی گێڕایەوە بۆ هاوڕێکەی!

بەڕاستی دادوەرییەکەت کەم وێنەیە، بەبێ زیندان، بەبێ سوێندخواردن، بەبێ دواخستنی دادگاییەکە، بێئەوەی سکاڵاکار شایەتێکی هەبێت، هاوکات مافەکەی بۆ گێڕاوەتەوەدو نەیهێشتووە فێڵبازەکان، بە مەرامی خۆیان بگەن..

بەو هیوایەی دواجار ببینە خاوەنی قازییەکی بیرتیژو لێهاتووی وەکو هەیاسی خاس!

## درەختێکی دوور





# پێغەمبەر موحەممەد صلى الله عليه وسلم

بەرزان ئەبوبەکر

## گەورەترین مرۆڤ لە مێژوودا ٥٧١ - ٦٣٢ زایینی

بەشی یەکەم

نووسینی ژیاننامەی پێغەمبەر (موحەممەد)، نەك بە وتارێك، بەڵکو بە چەندین پەڕاوو کتێب تەواو نابێت؛ لەبەرئەوە نامانەوێت لێرەدا بە کرچوکاڵی باس لە ژیانی پێشەوای ئازیز بکەین، بە پشتیوانی خودا لە کتێبی (منداڵە بێباوکەکان)دا، کەمێك بەدرێژی باس لەو گۆڕانکارییانە دەکەین، کە لەسەر دەستی پێشەوای ئازیز بەدی هاتووە، بەڵام لەم ژمارەیەدا، بەکورتی ئاماژە بە چەند خاڵێکی گرنگ دەکەین..

د. مایکل هارت.. لە کتێبە بەناوبانگەکەی کە بە ناونیشانی ١٠٠ کەسە نەمرەکە نووسیویەتی، هاوکات ئەم کتێبە گینسدا تۆمار کراوەو یەکێکە لە کتێبە پڕفرۆشترینەکانی جیهان، موحەممەد پێغەمبەر «ﷺ» وەکو یەکەم کەسایەتی دەستنیشان کردووەو لە کتێبەکەیدا ڕیزبەندیی ژمارە یەکی پێداوە، د. مایکل هارت دەڵێت: دوای بەدواداچوونو خوێندنەوەی ژیننامەکەی بۆم دەرکەوت کە کاریگەرترین کەسایەتی مێژووە، لەبەرئەوە ڕیزبەندیی ژمارە «١» پێداوە، لەوبارەیەوە دەڵێت:

کاتێك موحەممەد پێغەمبەرم کردە ژمارە یەکی کتێبەکەم، کۆمەڵێك کەس سەرسامبوون بەم دەستپێکەو ڕەخنەیان لێگرتم، لە وەڵامدا وتم: موحەممەد پێغەمبەر «ﷺ» تاکە مرۆڤە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، کە سەرکەوتنێکی گەورەو بەرچاوی بەدەست هێناوە لەسەر ئاستی دینیو دونیایی.. هەروەها دەڵێت: موحەممەد پێغەمبەر «ﷺ» بانگەوازی بۆ ئیسلام کردووەو توانیویەتی ئیسلام بڵاو بکاتەوە لە نێو خەڵکیدا، ئیسلام بووە بە یەکێك لە گەورەترین ئایینەکانی دونیا، موحەممەد پێغەمبەر «ﷺ» بووەتە سەرکردەیەکی سیاسیو سەربازیو دینی، دوای زیاتر لە چواردە سەدە لە کۆچی دوایی موحەممەد پێغەمبەر «ﷺ»، تا ئێستاش کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر مرۆڤایەتی هەیە، هەروەها لە درێژەی قسەکانیدا د. مایکل دەڵێت: زۆرینەی ئەو کەسانەی من هەڵم بژاردوون لە نێو شارستانییەتەکانو گەلە پێشکەوتووە سیاسیو فیکرییەکاندا لەدایکبوونو گەورەبوون، تەنها موحەممەد پێغەمبەر «ﷺ» نەبێت، کە لە ساڵی ٥٧١ زایینی لە شاری مەککە، لە نیوەدوورگەی عەرەب لە ناوچەیەکی جیاوازو دوور لە شارستانییەتو لە جیهانی کۆندا لەدایك بووە، کە دوور بووە لە سەنتەری بازرگانیو شارستانییەتو هونەرو ڕۆشنبیری، موحەممەد پێغەمبەر «ﷺ» باوکی کۆچی دوایی کردووە، پێش ئەوەی لەدایك ببێت، کاتێك تەمەنی دەگاتە شەش ساڵان، دایکیشی کۆچیی دوای دەکات، لە بارودۆخێکی دژوارو ناڕەحەتدا گەورەبووەوە، توانای نووسینو خوێندنەوەشی نەبووە! تەنانەت لە ڕووی داراییشەوە، کەسێکی هەژار بووە، تا ئەو کاتەی هاوسەرگیری لەگەڵ بێوەژنێکی بازرگاندا کردووە. کاتێکیش تەمەنی دەگاتە چل ساڵ، دەبێتە خاوەن کەسایەتییەکی پتەوو پۆڵایین لە نێو خەڵکیدا، ئەو کات زۆرینەی عەرەبەکان بتپەرستبوون، ژمارەیەکی یەکجار کەم لە مەسیحیو یەهودی لە شاری مەککە بوونیان هەبووە، لەبەرئەوە موحەممەد پێغەمبەر «ﷺ» هیچ زانیارییەکی لەبارەی ئەو دوو ئاینە نەبووە!

ئەم چەند دێڕە سەرەتای ئەو باسەیە کە د. مایکل هارت لە کتێبەکەیدا باسی لە پێشەوای مرۆڤایەتی کردووە..

**کورتەیەك لە ژیاننامەی پێغەمبەر «موحەممەد» «ﷺ»:**

پێغەمبەر «ﷺ» ناوی «موحەممەد» کوڕی «عەبدوڵڵا»ی کوڕی «عەبدولموتەللیب»ە. دایکیشی ناوی «ئامینە»ی کچی «وەهەب»ە، یەکێکە لەو منداڵانەی بەبێباوکی گەورە بووە، لە تەمەنی منداڵیدا دوچاری سێ کۆسپی زۆر سەخت بووەوە:-

**کۆسپی یەکەم:-** موحەممەد هێشتا لە سکی دایکیدا بوو، واتە: لەدایك نەببوو، باوکی ماڵاوایی لە ژیان دەکاتو بۆ دواجار چاوەکانی لێك دەنێت، واتە: موحەممەد بە چاوەکانی خۆی باوکی نە دیتووەو بە بێباوکی لەدایك بووە.

کاتێك موحەممەد «ﷺ» لەدایك بوو، عبدالمطلبی باپیریی، ناوی نا موحەممەد «واتە زۆرسوپاسکراو»، کە تا ئەو کاتە ناوی وا نەبوو لە ناو عەرەبدا. قوڕەیشییەکان -کە عەرەبنو نەوەی ئیسماعیلنو دانیشتووانی مەککەن- لە «عبدالمطلب»یان پرسی: بۆچی لە ناوی باووباپیران لات داو ناوی موحەممەد چییە؟ ئەویش گوتی: بە هیوای ئەوەی ئەم کوڕەم، هەموو خەڵکی سەرزەوی سوپاسی بکەن.

**دووەم کۆسپ لە ژیانی موحەممەددا «ﷺ»:**

موحەممەد تەمەنی گەیشتە شەش ساڵ، خاتو ئامینەی دایکی بۆ دواجار چاوەکانی لێك دەنێتو بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیانو لە موحەممەدی کوڕە تاقانەی دەکات، ئیدی هەر لەم تەمەنەوە، واتە: موحەممەد تەمەنی شەش ساڵان بوو، دوور لە سۆزی باوکایەتیو بەدەر لە ئامێزی پڕ میهریی دایکی، ژیانی گوزەراندووە، منداڵێك تەمەنی تەنها شەش ساڵە، نە دایکی هەیە، نە باوك، نە خوشکی هەیەو نە برا..

**سێیەم کۆسپ لە ژیانی موحەممەددا «ﷺ»:**

لێرەوە، واتە: دوای کۆچی دوایی دایکی ئەزیزی، عەبدولموتەلیبی

باپیری گرتییه خۆیو له جاران زیاتر خۆشەویستی دەدا بە موحەممەدی کوڕەزایو دەیگوت: ئەم کوڕەم پاشەڕۆژێکی گەورەی دەبێت. باپیری نازی زۆری کێشاو زۆر بەجوانی چاودێری دەکرد، بەڵام ئەم نازو خۆشییەش، زۆر درێژەی نەکێشا، تەنها دوو ساڵی خایاند، واتە: موحەممەد تەمەنی بوو بە هەشت ساڵان، باپیریشی کۆچی دوایی کردو دووبارە موحەممەد بێناز کەوتەوە.

پاشان ئەبوتاڵیبی مامی سەرپەرشتیی موحەممەدی گرتە ئەستۆ، ئەبوتاڵیب پیاوێکی دەستکورت بوو، خاوەنی کۆمەڵێك منداڵ بوو، نەیدەتوانی وەکو پێویست، نازی برازاکەی هەڵبگرێت، بەڵام هەتا بڵێی کەسێکی ڕێزدارو خۆشەویست بوو، لە لای قورەیش.

## موحەممەد «ﷺ» لە تەمەنی لاویدا:

لەبەرئەوەی ئەبوتاڵیبی مامی، پیاوێکی هەژارو خێزاندار بوو، موحەممەد بوو بە شوان؛ بۆئەوەی هاوکاریی مامی بکاتو کەمێك باری سەرشانی مامی سووك بکات، «شوانی کاری هەموو پێغەمبەران بووە، هەروەکو خۆی دەفەرموێت: «هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، شوانێتی نەکردبێتو مەڕی نەلەوەڕاندبێت». هاوەڵان گوتیان: تۆش ئەی پێغەمبەر«ﷺ»؟ فەرمووی: بەڵێ، منیش شوانیم بۆ مەککەییەکان بە مووچەیەکی دیاریکراو دەکرد.

## «صادق الأمین»:

ڕۆژەکان تێپەڕین، موحەممەد بووە گەنجێکی بەهێزو دیار لەنێو قورەیشدا، گەنجێك لە هەموو کەسێك پاکترو چاکترو ئاکاربەرزتر بوو، قورەیشییەکان لەبەر دەستپاکیو ڕەوشتبەرزییەکەی، نازناوی «صادق الأمین: ڕاستگۆی جێمتمانە»یان پێبەخشی بوو، موحەممەد «ﷺ» کەسێکی ئاکارجوانو مامەڵەی درووستو هێمنو لەسەرخۆو میهرەبان بوو، خۆنەویستو بەخشندە بوو، حەزی بە یارمەتیو هاوکاریی هەموان دەکرد، بە ڕەوشتە جوانو ناوازەکانی، جێگەی خۆی لە دڵی هەمواندا کردبووەوە، موحەممەد هەر لە تەمەنی لاویدا، وەکو گەورەو پیاوماقووڵان هەڵسوکەوتی دەکرد.. هەرچەندە بێدایكو بێباوكو بێخوشكو براو بێباپیر بوو، بەڵام ئەمانە، کاریگەریی نەرێنییان نەکردە سەر ڕەوشتو ئاکاری بەرزو کەسایەتییەکەی.

خاتوو خەدیجە، کاتێك ناوبانگی دەستپاکیو لێهاتوویی موحەممەدی بیست، بانگهێشتی کردو ڕای سپارد؛ تا بە پارەو سامانەکەی، بازرگانی بۆ بکات، ئەویش ڕەزامەندیی دەربڕیو سەرپەرشتی کاروانێکی بازرگانیی خاتوو خەدیجەی کرد بۆ وڵاتی شام، لەو کاروانەدا خاتوو خەدیجە، خزمەتکارێکی خۆی، بە ناوی «مەیسەرە» لەگەڵ موحەممەد «ﷺ»دا نارد. مەیسەرە بەردەوام چاودێریی کارو کردەوەی موحەممەد «ﷺ»ی دەکرد. ئەو سەفەرەش زیاتر لە دوو مانگی خایاند. کڕینو فرۆشتنیان بەجێ هێناو بە قازانجێکی زۆرەوە گەڕانەوە. مەیسەرە چووە لای خاتوو خەدیجەو بەدرێژی باسی دڵسۆزیو دەستپاکیو دڵپاکیو میهرەبانیو بەزەییی موحەممەدی «ﷺ» کرد. هەروەها باسی قازانجی زۆری چەند هێندەی جارانی بۆ کرد. بەم باسەش ڕێزی موحەممەد «ﷺ» لە دڵی خاتوو خەدیجەدا، هێندەی تر زیادی کرد. خاتوو خەدیجە بەم هەواڵە زۆر دڵخۆشبوو، لەبەرئەوە ناردی بەدوای موحەممەداو پێی گوت: ئامۆزا ئەگەر تۆ ڕازی بیت، ئەوە من ئامادەم ببمە هاوسەری ژیانت؟؟

خاتوو خەدیجە ئافرەتێکی خانەدانو ڕەوشتبەرزو ژیرو کارامەو لێهاتوو بوو، نابێتو ناکرێت موحەممەد ئەم داواکارییە ڕەت بکاتەوە، لەبەرئەوە بەخۆشحاڵییەوە بە داواکەی خاتوو خەدیجە ڕازی بوو، بۆ ئەم مەبەستە گەڕایەوە ماڵەوەو پرسو ڕاوێژی بە مامی کرد، ئەویش بە خۆشحاڵییەوە ڕەزامەندی نیشان دا.. ئیدی گەورە پیاوانو پیاوماقووڵانو نزیکانی خۆیان کۆکردەوەو بەرەو ماڵی خاتوو خەدیجە بەڕێکەوتن.. بەم شێوەیە لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا موحەممەد بۆ یەکەمجار هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوو خەدیجە ئەنجامدا.. ئەو کاتەش خاتوو خەدیجە تەمەنی ٤٠ ساڵ بوو.

## * موحەممەد «ﷺ» تەمەنی گەیشتە ٤٠ ساڵ:

وەکو نەریتی هەمیشەیی خۆی، لە مانگی ڕەمەزاندا دەڕۆیشتە ئەشکەوتی حەڕا، بیری لە درووستکردنی گەردوونو بوونەوەر دەکردەوە، «ئەو کات قورەیشییەکان خەڵکانێکی بتپەرستبوون، بە دەستی خۆیان، لە داروبەرد بتیان دادەتاشیو وەکو خودا سەیریان دەکردو بڕوایان وابوو خێرو شەڕ، چاکەو خراپە، قازانجو زیانیان بە دەستە، تەنانەت گەر بیانویستایە گەشتێك بکەن؛ دەڕۆیشتنە پەرستگاکانیانو پرسو ڕاوێژیان بە ئەو بتانە دەکرد، کە لایان وابوو، ئەوانە خودان»، ئەمانەو چەندین نەریتی دیکەی قورەیشییەکان، بوو بەهۆی ئەوەی موحەممەد ژیرانەتر لەوان بیر بکاتەوەو بەدوای حەقیقەتو ڕاستیدا بگەڕێت.. موحەممەد لە تەواوی مانگی ڕەمەزاندا، لە ئەشکەوتی حەڕادا دەمایەوە، جاروبار خاتوو خەدیجەی خێزانی، نانو ئاوو پێداویستی بۆ دەبرد بۆ ئەشکەوتی حەڕا، ئەو لە تەنهاییدا بیری دەکردەوەو بە خۆی دەگوت: ناکرێت شتێك نە سوودی هەیەو نەزیان، تەنانەت ناتوانێت پارێزگاری لە خۆی بکات، چ جای ئەوەی بتوانێت پارێزگاری لە دەوروبەرەکەی بکات، ناگونجێت مرۆڤ بیانپەرستێت، هەرگیز ناکرێت بڵێین خۆر لە خۆیەوە درووست بووە، شەوو ڕۆژ هەر لە خۆڕا دێنو دەچن، ئەستێرەو هەسارەکان کە ئاسمانیان ڕازاندۆتەوەو تەنانەت لە ژماردن نایەن، بڵێین ئەمانە هەر بە ڕێکەوت هاتوونەتە بوون، مرۆڤ بەم هەموو وردەکارییەوە، ناکرێت لە خۆیەوەو بەبێ مەبەست هاتبێتە نێو ژیان، ئەمانەو چەندین پرسیاری دیکە، لە بیرو هزری موحەممەددا دەخولانەوەو عەودالی وەڵامێکی گونجاوو حەقیقەتێکی ڕاستەقینە بوو، تا دواجار ئەو خۆرە هەڵهاتو بۆ یەکەمجار لە هەمان ئەشکەوت لەڕێگەی فریشتە جبریلەوە سرووشی بۆ هات، هەرچەندە موحەممەد خوێندەواری نەبوو، بەڵام جبریل ئایەتەکانی بۆ خوێندەوە، تا ئەو کاتەی لەبەری کرد، یەکەم ئایەتی سرووش بە «اقرأ» دەستی پێ کرد: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ........ ﴾، ئەم چەند ئایەتە بووە سەرەتای دابەزاندنی سرووشو گۆڕانکاری گەورە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، دوای ئەم ڕووداوە، موحەممەد گەڕایەوە ماڵەوەو هەواڵەکەی بۆ خاتوو خەدیجەی هاوسەری باس کرد، خاتوو خەدیجە وەکو ئافرەتێکی بەئەزموونو ژیر پیرۆزبایی لێکردو پێی گوت: تۆ دەبیتە پەیامبەر، بۆ ئەو مەبەستە پێکەوە ڕۆیشتن بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە کەسێکی شارەزابوو لە ئاینی مەسیحیدا، ئەویش بە هەمان شێوە مژدەی پێدا کە بووەتە پێغەمبەر..

پاشان گەڕانەوە ماڵەوە، پێغەمبەر «ﷺ» چووە نێو جێگەکەیەوەو داوای لە خاتوو خەدیجە کرد کە دایپۆشێت، لەو کاتەدا یەکەم سوورەتی قورئان بە ناوی «المدثر»هاتە خوارەوەو فەرمانی پێکرد: ئەی داپۆشراو هەستەو پەیامەکەت بگەیەنەو.... هتد.

ژینگە

جەلال عەبدوڵڵا حاجی

# دیاردەی ئەلنینۆ و لانینا..؟!




تێکچوونی هاوسەنگی ژینگەیی، بەهۆی کارەکانی مرۆڤەوە، هۆکارێکە بۆ تێکچوونی کەش‌و هەوای جیهانی، بەڵام هەندێك لەو گۆڕانکارییانەی لەکەش‌و هەوادا ڕوودەدەن، دیاردەی سرووشتین‌و هەر لە کۆنەوە هەبوون، وەك: کاریگەریی گرکانەکان‌و ناوچەتاریکەکانی خۆرو دیاردەی ئەلنینۆو لانینا، ڕاستە پیسبوونی ئاوهەوا وای کردووە دیاردەکان بەهێزتر دەربکەون‌و ئاسەواری وێرانکەریان هەبێت، بەڵام هەندێك لەو دیاردانە سرووشتین‌و ناو بەناو ڕوودەدەن، دیاردەی (ئەلنینۆو لانینا) لەو دیاردە سرووشتیانەن.

لە ساڵانی هەشتاو نەوەدەکانی سەدەی ڕابوردوو، لەبارەی ئەم دیاردەیە قسەو باسی زۆر دەکرا، لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا، باسوخواسی سیاسی‌و خەڵکانی ئاسایی بوو، لە پەرلەمانەکاندا گفتوگۆیان لەسەر دەکرد، بابەتەکە پەیوەندیی هەبوو بە باوبۆرانی بەهێز، زریانی توندو بارانی بەخوڕەوە، لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا، لەگەڵ وشکەساڵی‌و ئاگرکەوتنەوە لەناوچەکانی تر، ئەم دیاردەیە، بە (ئەلنینا) ناو دەبرا، شتێکی نوێ بوو، خەڵکانی ئاسایی پێشتر نەیانبیستبوو، لە ساڵی (١٩٨٢-١٩٨٣)دا (ئەلنینۆی) بەهێز ڕووی دا، ئەنجامەکەی زۆر وێرانکەر بوو بۆ خەڵکی‌و ماڵ‌و موڵکەکانیان، بوو بەهۆی مایەپووچبوونی چەندین کۆمپانیای بیمە، بەهۆی داوای قەرەبووکردنەوەی زیانەکانیان، کە بڕەکەی دەگەیشتە (٨ ملیار دۆلار) بوو، دیاردەکە بوو بە جێی گرنگی پێدانی خەڵکی، بەزۆری ئەو وڵاتو نەتەوانە گرتەوە، کە دەکەونە سەر زەریای هێمن‌و هندی، بەتایبەتی ئەوانەی لە هێڵی کەمەرەی زەوییەوە نزیکن، هەروەها کاریگەری لەسەر کەش هەبوو، بەتایبەتی زریان‌و وەرزی بارانبارین‌و وشکەساڵی، ناوچەیەکی بەرینی گرتەوە، هەرچەندە لە جەرگەی ڕووداوەکەوە دووربوون. کۆمەڵە زانستییەکان‌و وڵاتانی پەیوەندیدار بەشدارن، لە ناسینی ئەم دیاردەیە، بەئامانجی پێشبینیکردنی ڕوودانی‌و قەبارەکەی، بۆ دووکەوتنەوەو کەمکردنەوەی زیانەکانی لەکاتی ڕوودانیدا.

لە پاش لێکۆڵینەوە لە تۆمارە مێژووییەکان، دەرکەوت ئەم دیاردەیە زۆر کۆنە، هەروەها ئاڵۆزیشە، لەساڵی (١٥٦٧) دیاردەی ئەلنینۆ El Nino ڕووی داوە، ئەو سەردەمە ڕووداوەکەیان پەیوەست نەکرد بە کەمی ماسی لە دەریا، هەروەها وشکەساڵی، یان بارانی بەخوڕەوە، کە دەبووە هۆی لەناوبردنی کشتوکاڵ، بەهۆی لافاوی زۆرەوە، دەریاوان‌و ماسیگرەکان هەر زوو تێبینی ئەم دیاردەیان کرد، لە کەناراوەکانی وڵاتی پیرۆ، (دەکەوێتە سەر زەریای هێمن، لە کەناری ڕۆژئاوای ئەمریکای باشوور، هێڵی پانی ١٠ پلە لە باشووری هێڵی کەمەرەی زەوییەوە)، لە باری ئاساییدا، ڕاوچیەکانی وڵاتی (پیرۆ)و (ئیکوادۆر) بەلەمی بچووکیان بەکار دەهێنا؛ بۆ ڕاوکردنی ماسی، ئاوەکە ساردو ماسی زۆرو زەوەند بوو، ئاڕاستەی شەپۆلە ئاوییەکان لە باشوورەوە بەرەو باکور بوو، بەڵام لە ساڵانێکی دیاریکراودا، کە بەشێوەیەکی نارێك دووبارە دەبوویەوە، لە نێوان (٢-٧) ساڵ جارێك ڕووی دەدا، ئاوەکان گەرم دەبوون، ئاڕاستەی شەپۆلە ئاوییەکان پێچەوانە دەبوونەوە، ماسی کەمی دەکرد، ڕاوکردن بێسوود بوو، لوتکەی دەرکەوتنی ئەم دیاردەیە، لەکاتی پشووی سەری ساڵدا (کریسمس) ڕووی دەدا، بۆیە ڕاوچییەکان ناویان لێنا (ئەلنینۆ El Nino).

ئەلنینۆ دیاردەیەکی سرووشتییە، هەزاران ساڵە بەشێوەی خول دووبارە دەبێتەوە، بەڵام دووبارەبوونەوەکەی پێشبینی ناکرێتو نارێکە، لە ماوەی (٢-٧) ساڵ جارێك دووبارە دەبێتەوە، تێکڕای ڕوودانی بەشێوەیەکی ئاسایی لە نێوان (١٢-١٨) مانگ بەردەوام دەبێت، کاریگەریی ڕوودانەکە لەسەر کەش‌و هەوای جیهانی، لە جارێکەوە، بۆ جارێکی تر جیاوازە.

**ئەم دیاردەیە چۆن ڕوو دەدات؟** ئەم دیاردەیەی کەش‌و هەوا، لە زەریای هێمندا ڕوو دەدات، دواتر درێژ دەبێتەوە بەرەو (زەریای هندی)و ئەمبەرو ئەوبەری هێڵی کەمەرەی زەوی دەگرێتەوە، کە دەکاتە نێوان وڵاتی پیرۆو ئیکوادۆر لە ئەمریکای باشوورو ئەندەنووسیاو ئوسترالیا لە لای ڕۆژئاواوە، لەکاتی هەڵکردنی بای بازرگانی (بای ڕۆژهەڵات) بەرەو ڕۆژ ئاوا، بڕێکی زۆر هەڵمی ئاوی زەریا هەڵدەگرێت، پاڵ بە ئاوی زەریاکەوە دەنێت بەرەو ڕۆژئاوا، بەجۆرێك ئاستی ئاوەکە، نیومەتر بەرزتر دەبێتەوە لە ڕۆژئاوا (نزیك ئەندەنووسیا)، بارانێکی زۆر لە ئەندەنووسیا دەبارێت، ئەمە لە باری ئاساییدا، بەڵام لەکاتی ڕوودانی (ئەلنینۆ)دا، کارەکە پێچەوانە دەبێتەوە، بەری ڕۆژهەڵات سارد دەبێت، دەبێتە هۆی باران بارینێکی زۆرو لافاو لە وڵاتی پیرۆو ئیکوادۆر.

لە ساڵی ١٩٨٦-١٩٨٧ دیاردەی (ئەلنینۆ) ڕووی دا، هێزی ڕوودانەکەی کەمتر بوو، بەڵام (ئەلنینۆ)ی ساڵانی (١٩٩٠-١٩٩٥) درێژترین ماوەی هەبوو لە (١٣٠) ساڵی ڕابوردوودا، ساڵی (١٩٨٨-١٩٨٩) دیاردەی (لانینا) ڕووی دا، ئەم دیاردەیە ڕاستەوخۆ لەدوای ئەلنینۆ ڕوو دەدات، بەڵام هەموو جارێك ڕوونادات، وشەی لانینا (La Nina) بەزمانی ئیسپانی واتە: (کچی بچکۆلە)، ئەم دیاردەیە ئەنجامی پێچەوانەی ئەلنینۆیە، دەبێتە هۆی سارد بوونی ئاستی ئاو، لە کەناراوەکانی ڕۆژهەڵاتی زەریای هێمن.

ئەم دوو دیاردەیە، کاریگەریی گەورەیان هەیە لەسەر ئاستی جیهانی، وەك بارانبارین، لافاو باوبۆران، وشکەساڵی، ڕەوی ماسی‌و گیانەوەران، ئاگرکەوتنەوە، برسێتی‌و دەربەدەربوون. هۆکاری تریش هەن، کار لەم دەرەنجامانە دەکەن، پیسبوونی ژینگە، یەکێکە لەو هۆکارانە، زانایان لێکۆڵینەوە لەم هۆکارانە دەکەن بۆ ناسینی کەش‌و هەواو ئاڕاستەکردنی بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی‌و کەمکردنەوەی زیانەکان.

سەرچاوە/ کتێبی: (حل مشكلة الطاقة هو التحدى الاكبر للبشرية فى القرن الحادى والعشرين!! — فؤاد قاسم الامير).



ئەدیبو نووسەری گەورەو بەناوبانگ

# عباس مەحموود عەققاد

(١٨٨٩ - ١٩٦٤)

کە دەروونەکان بەرزو گەورەبوون، لە بەدیهێنانی ئامانجیاندا، جەستەکان شەکەت دەبن... المتنبی

## عەباس مەحموود عەققاد

### بلیمەتێك، خاوەنی زنجیرە کتێبی «بلیمەتییەکان»

عەباس مەحموود عەققاد لە شاری ئەسوان لە صەعیدی وڵاتی میسر لە ١٨٨٩/٦/٢٨ لەدایك بووە، لە خێزانێکی بەرێزو بەخشندەدا گەورە بووە، خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ئەسوانی شازادەکان خوێندووە، لەگەڵ باوکیدا لە کۆڕو کۆبوونەوەی زانایانی ئەزهەر دادەنیشت، هەر لە منداڵییەوە حەزی بە خوێندنەوەو شیعر بووە، هەمیشە سەرقاڵی خۆڕۆشنبیرکردنو فراوانکردنی ئاسۆی ڕۆشنبیریی خۆی بووە.

لە ساڵی ١٩٠٣ خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە، بەڵام دوای خوێندنی سەرەتایی درێژەی بە خوێندن نەداو نەیتوانی پلەکانی دیکەی خوێندن ببڕێت، بەڵکو ڕووی کردە مەیدانی کارکردنو لە کارگەی ئاوریشم، لە شاری دمیات دەستی بە کارکردن کرد، بەڵام لە هەمان کاتدا شەیداو خولیای خوێندنەوە بوو، لە بوارە جیاوازەکاندا، لەبەرئەوە بەشێکی زۆری مووچەکەی بۆ کڕینی کتێب تەرخان دەکرد.

دواتر عەققاد بووە فەرمانبەری حکومی لە شاری قەناو زەقازیق، پاشان گوسترایەوە بۆ شاری قاهیرە؛ لە قاهیرە بە تەواوی جێگیر بوو.

عەققاد لە شاری قاهیرە لەگەڵ (موحەممەد فەرید وەجدی)، لە ساڵی ١٩٠٧، بەشداری کرد لە دەرکردنی ڕۆژنامەی دەستوور، دەرکردنی ئەو ڕۆژنامەیە، بوو بە هەلێك بۆ عەققاد؛ بۆئەوەی لە ڕێگەیەوە بە سەعد زەغلوول ئاشنا ببێتو باوەڕ بە بۆچوونو بیروڕاکانی بهێنێت، بەڵام بۆ ماوەیەك ڕۆژنامەکە وەستا، پاشان ساڵی ١٩١٢، عەققاد ڕۆیشت بۆ کارکردن لە ڕۆژنامەی موئەییەد.

لەو ماوەیەدا، عەققاد بە بارودۆخێکی دارایی سەختدا تێپەڕی، لەبەرئەوە ناچار بوو وانە لە بەرامبەر بڕێك پارەدا بڵێتەوە؛ بۆ بەدەستهێنانی بژێوی ژیانی، عەققاد وەکو مامۆستایەك وانەی دوتەوە تاساڵی ١٩١٧، دواتر لە ساڵی ١٩١٩ بۆ کارکردن ڕۆیشت بۆ ئەهرام، بەرگرییەکی زۆری لە بیروبۆچوونو سیاسەتی سەعد زەغلوول کرد، سەبارەت بە شێوازو بیروڕاکانی، سەبارەت بە وتوێژی لەگەڵ ئینگلیزەکان، عەققاد ئینتیمای بۆ پارتی وەفد هەبوو، تا ساڵی ١٩٣٥ ئەو کاتەی دەستی لە کاری سیاسی کێشایەوە، بە هۆی پێکدادانی بە سەرۆکی پارتی ئەو کات مستەفا نەحاس، پاشان ڕووی کردە دانانو نووسین بۆ ڕۆژنامەکان، لە «روز الیوسف»و «هلال»و هەواڵی ڕۆژانەو گۆڤاری ئەزهەر.

عەققاد هەرگیز لە بەرهەمهێنانی کارە ئەدەبییەکانی نەوەستاوە، هەرچەندە بارودۆخی دژوارو سەخت بووایە، چەندین وتاری نووسیوەو ناردوویەتی بۆ گۆڤارە وەرزییەکان، هەروەها هەندێك بابەتی وەردەگێڕا.

بەڵام کارە ئەدەبییەکانی زۆرن، قورسە ژمێرەکردنیان، سەرەتای بەرهەمە شیعرەکانی دەگەڕێتەوە، بۆ پێش سەرهەڵدانی جەنگی یەکەمی جیهانی، چاپی یەکەمی دیوانەکەی ساڵی ١٩١٦ دەرچوو، چاپی دووەمی ساڵی ١٩٢٨ لە چوار بەرگدا چاپ کرا، دوابەدوای دیوانەکەی کۆمەڵێك کتێبی شیعری بە ناونیشانی جیاواز (وحي الأربعين)، (هدية الكروان)و (عابر سبيل) دەرکردووە.

عەققاد بە هاوکاری ئیبراهیم مازنیو عبدالرحمن شکری قوتابخانەی ئەدەبیی دیوانیان دامەزراند، لەو قوتابخانەیەدا کاریان تازەگەری لە شیعرو دەرچوون بووە لە شێوە تەقلیدییەکەی.

عەققاد نامەیەکی نووسی بۆ ئیبن ڕومی، کە هونەری وتاری تێدا بوو، لە دیارترین کارەکانی عەققاد زنجیرەی (عبقریات: بلیمەتییەکان) کە بەدرێژی باس لە ژیانی کەڵەپیاوانی ئیسلام دەکات، وەکو (عەبقەریەتی موحەممەدو عەبقەرییەتی عومەرو عەبقەرییەتی خالدو چەندانی دیکە)، بەڵام عەققاد تەنها ڕۆمانێکی نووسیوە، ئەویش ڕۆمانی «سارا»یە هەروەها لە گرنگترین دانراوەکانی عەققاد (فەلسەفەی قورئانیو خودا، ئیبلیس، مرۆڤ لە قورئانی پیرۆزدا، لە ئەدەبو هونەردا).

عەققاد بەردەوام بوو لە بەرهەمهێنانو نووسین تا ئەو کاتەی ژمارەی پەرتووکە دانراوەکانی بووە زیاتر لە سەد کتێبو هەزاران وتاری لە ڕۆژنامەکانو گۆڤارەکاندا بڵاو کردۆتەوە، عەققاد پلەیەکی بەرزی لە ڕاپەڕینی نوێی ئەدەبیدا هەبوو.

عەققاد ژیاوە دور لە وەزیفەو مەنسەبەکانی، نەك لەبەرئەوەی ڕقی لێی بووە، بەڵکو پارێزگاری لە سەربەستیوئازادی دەکرد، دەترسا نەبادا فەرمانبەری، ڕێ لە عیشقی زانینی بگرێت.

لە گەرمەی چالاکییەکانی شاندی میسریدا، عەققاد سەروتارە سیاسییەکانی لە ڕۆژنامەکاندا دەنووسی، وەکو (البلاغ) و(الجهاد)، هەروەها ساڵی ١٩٣٦ ژیاننامەی سەعد پاشا زەغلوولی نووسیوە، هەروەها عەققاد ژمارەیەك توێژینەوەی گرنگی بۆ ئێستا نووسی، بە پێنووسی قوتابییەکانی. بە هۆی زۆر بەرهەمو خزمەتو قەڵەمە بە برشتەکەیەوە، سەرۆکی ئەو کاتی میسر (جمال عەبدولناسر) خەڵاتی ڕێزلێنانی دەوڵەتی لە بواری ئەدەب پێبەخشی، بەڵام عەققاد خەڵاتەکەی ڕەت کردەوەو وەری نەگرت.

عەققاد لە ١٣ مارس ساڵی ١٩٦٤، لە تەمەنی ٧٥ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

# ئایە دڵتەنگیت ڕێگرە لە بەردەم بەختەوەریت؟

ئا: هدى محمود حسن

کاتێك بیر لەوشـەی دڵتەنگی، یان خەمباری دەکەیتەوە ڕاستەوخۆ هەسـت بەماندووبوونـی جەسـتەو هەسـتەکانمان دەکەیـن، بێگومان خۆشـیو ناخۆشـی لەژیاندا هەیە. وەك خوێی چێشت وایە ئەگەر خوێ لە هەرخواردنێکدا زۆر بێت؛ ئەوا تامەکەی لەدەست دەدات، ئەگەرمرۆڤ بەردەوام خەمبار بێت؛ ئەوا ئەو ئەرکانەی کە لە ئەستۆیدایە؛ ناتوانێت بەباشـی بەئەنجامـی بگەیەنێت، بۆیـە ئەم ئامۆژگاریـەت لەبیر بێت (کەخۆشـیو بەختەوەری هەتا سـەر نییە، بەهەمان شـێوە ناخۆشـیو ناهەمواری بۆ کەسـێك نەبڕاوەتەوە، بەڵکو ئێمە بە بیرکردنەوەکانمان هەسـت بەخۆشـیو بەختەوەری دەکەین). بۆیە کاتێك ئێمە لە کارێکدا سـەرکەوتوو نەبویـن؛ نابێت لە ڕادەی خۆی زیاتر، هەسـت بەخەفەت بکەین؛ چونکە ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی ئارامیو حەوانەوەت لەدەسـت بدەیـتو باری دەروونیو جەسـتەییت تێك بچێت، بۆیە پشـت بەخودا ببەسـتە لە کارەکاندا، ئەگەر ئەوت لە پشـت بێت؛ ئەوا لە بەختەوەری بێبەشـت نـاکات؛ چونکـە خـودا بەبەزەییـە بەرامبـەر بـە هەموو درووسـتکراوەکانی، جا کاتێك ناخۆشی دێتە سـەر ڕێت، لەبری ئەوەی فرمێسك بڕێژیتو خۆت تووشی دابڕان بیت لە کۆمەڵگەو خۆت تووشی خەمۆکی بکەیت، هەوڵ بدە بیر بکەیتەوەو کێشـەکە چارەسەر بکەیت، هەر ناخۆشـییەك کە ڕوو دەدات هەوڵ بدە بە شـێوەیەکی هاوسـەنگ مامەڵـەی لەگەڵدا بکەیت؛ چونکە کەس نازانێت خێر لە چیدایە؛ تەنها خـودا دەزانێت، چی خێری تێدایە بۆت، هەروەکو دەڵێن: (لە لیمۆیەکی ترش، شـەربەتێکی شـیرین درووسـت بکە، تەنها پێویسـتت بە چەند کلۆشـەکرێکە)، کەواتە هەمیشـە لەژیانتدا، دڵخـۆشو لێوبەخەندە بە، ئەگەر لە ئێسـتادا، خۆت دڵخۆش نەکەیت، ئەی چۆن بەختەوەر دەبیت لە داهاتوودا؟؟؟ جا بەختەوەری شـتێك نییە، کە لە هەسـارەیەکی تردا بەدوایدا بگەڕێیت؛ چونکە خۆ تۆ لەسـەر هەسارەی زەوی دەژی، بەڵکو لە دەروونی خۆتدا بەدوایدا بگەڕێ.

سەبارەت بە خەمو خەفەت پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (خودایە پەنـات پێ دەگرم لـە خەمو خەفەت، لـە دەستەوسـانیوتەمەڵی، لە ترسنۆکیو پیسکەیی، لە زۆربوونی قەرزو زاڵبوونی زۆرداران). بۆیە زۆر کەس دەبینیت، کە لە کارێکی لەژیانیدا سەرکەوتوو نابێت؛ ئەوا خۆیان تووشی بێهیوایی دەبنو خۆیان تەسلیمی ڕووداوەکانی ژیان دەکەن، ئەوان بێئاگان لەوەی کە خوارێزی لێناون،خۆشەویستی پێبەخشیوون، زۆرجار ئەو کەسـانە زیان بەخۆیانو دەوروبەریان دەگەیەنن، وەك: (خۆکوشتن بەهەمووجۆرەکانییەوە، یان خوو دەدەنە چەند شـتێکی خراپ، لەوانە: جگـەرەو مەیخواردنەوە... ) کاتێك پێیان دەڵێیت: بۆ پەنا دەبەیتە بەر ئەم جۆرە شـتانە!؟ دەڵێت: بێزارمو لەم ژیانـەدا خەمو خەفەتم زۆرە، دەمەوێت لەبیری بکەم. ئەو نەك تەنها زیان بە خۆی دەگەیەنێت، بەڵکو زیان بەلاشـەو دەروونی خۆی دەگەیەنێـت، لەپێناو چەند کاتژمێرێکی کەمـدا، کە ئـازارو خەموخەفەتی دونیای لەکـۆڵ بکەوێت، بەڵام هەزار وەیل، بۆ ئەم جۆرە کەسـانە کە بەختەوەری، لـە ژیانیاندا بەیەکجاری لەناو دەبەنو زیان بەکەسـانی تریش دەگەیەنن، وەك دەڵێن: (گەشبینی لە فەرمانی خوداوەیەو ڕەشبینی لە مێشکی مرۆڤ خۆیەتی).. جگەلەوەی زیان بەماڵوسامانت دەگەیەنیت، زیان بەخێزانو کۆمەڵگەش دەگەیەنیت؛ چونکە ئەم دڵتەنگیەت، بەس بۆخۆت نییە، بەڵکو بۆدەوروبەرەکەشـتە؛ خۆ تۆ بەتەنها ناژیت لەسەرئەم هەسارەیە، ئەی وا نییە؟؟

ڕێـگای هەڵە مەگرە؛ تا ناخۆشـییەکان نەبێت بـە دوو هێندە، یان زیاتـر نەبێت، وەك لوقمانی حەکیم بـە کوڕەکەی دەڵێت: (کوڕی خۆم، کاتێك لەشساغ بوویت، دڵخۆش بە، کاتێکیش خەمبار بوویت، ناخۆشیو دڵتەنگـی خۆت بشـارەوە، ئەمە ئەوپەڕی خشـڵو چاکەیـە، ئارام بگرە لەسـەریان بۆت دەبێت بەتێشـووی دواڕۆژ). ئەگەر دەڵێیت دنیا خێری تێدا نییە بۆمن؛ ئەوا گوێ لەم ئامۆژگارییەی لوقمانی حەکیم بگرە کە دەڵێت: (ناخۆشـیو ناڕەحەتی زۆرم بینیوەو هەمیشـە لەسەری ئارامم گرتووە)، ئایە ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە، ژیانت بگۆڕی بۆخۆشـی، چێژ لە هەموو چرکەسـاتەکانی ژیانت وەربگریـت؟ چونکە تۆ نازانیت هەتا چەند سـاڵ دەژی؟ کەواتە: لە شـتی بێسـوودda، تەمەنت بەسەرمەبە، ئەوەش بزانە خەمو بێزاری، وەك باڵندە دەتوانێت بەسەرسـەرتا بڕوات، بـەڵام ئەوە گرنگە نەهێڵیت، هێلانەی لەسـەر درووسـت بکات. دەزانی مرۆڤ کە بیر دەکاتەوە، پلان بۆسـەرکەوتن دادەنێت، ئەگەرچی هەندێ جـار دەدۆڕێت، بەڵام دەبێت نەژی بۆمردن بمری بۆ ژیان، چۆن قازانج دەکەیت، تا نەکەیت زیان).



ن: دکتۆر مستەفا ئەبوسەعد ..... و: خالید موحەممەد



بەشی دووەم

# تۆ چ جۆرە باوکێکی؟

**B- کاریگەریی چەوساندنەوەی منداڵی:**

هەستی منداڵ بە چەوساندنەوەی لەکاتی منداڵیدا لە دەرئەنجامی خۆسەپێنیی باوك، هەستێکە لەگەڵیاندا گەشە دەکاتو کاریگەرییەکی زۆری دەبێت لەسەر مامەڵەیان لەگەڵ منداڵەکانیان لە دواڕۆژدا، جا یان ئەم ئاکارە یاداشت دەکەنو جارێکی تر بەرهەمی دەهێننەوە، یان هێزی تۆڵەسەندنەوە زاڵ دەبێت بەسەریانداو هەوڵی سەپاندنی دەدەن بەسەر منداڵەکانیاندا، یان هەوڵ دەدەن ئەم چەوساندنەوەیە نەگوێزنەوە بۆ منداڵەکانیان، ئەمەش کاریگەری دەبێت لەسەر هەڵوێستەکانیان، هەمیشە لەو ڕوانگەیەوە بیر دەکەنەوەو بڕیار دەدەن، نەك لە ڕوانگەی ڕاستیو باشیەوە..

**C- بۆچی باوکان منداڵەکانیان دەمکوت دەکەن؟**

لێرەدا لەوانەیە هەست بە گوناه بکەیت؛ بەهۆی شێوازی گفتوگۆت لەگەڵ منداڵەکەت، پارێزگاری لەم بیرۆکانە بکە لە بیرت داو لەیادیان مەکە، بەڵام شتی زۆر هەیە، دەتوانیت ئەنجامی بدەیت؛ بۆئەوەی ئەو پرۆگرامە کۆنە هەڵبوەشێنیتو بەسەریدا زاڵ بیت، جا گەر منداڵەکانت ئێستەش هەر منداڵن، یان چونەتە ڕیزی پێگەیشتووانەوە.

یەکەم هەنگاو خۆی لە (ناسینی خود)دا دەبینێتەوە، هەروەها بە زانینی ئەوەی کە بۆچی دەمکوتکردن، بوتە بەشێك لەکاری باوکایەتیت، ئەمە لەکاتێکدا زۆرینەی باوکان، تاوانبارن بەوەی کە کات نا کاتێك، پەنا دەبەنە بەر دەمکوتکردن، بێئەوەی پێویست بێت.

**سێ هۆکار هەیە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم باسە ئەوانیش:**

١- تۆ ئەوە دەڵێیت، کە پێت وتراوە!

٢- تۆ پێت وایە، ئەوەی ئەنجامی دەدەیت، هەر ئەوە ڕاستە!

٣- تۆ ئەو هەموو وزە کەڵەکەبووەت خاڵی دەکەیتەوە.

(لێکۆڵینەوەیەك ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە: ٨٥٪ ی ئەوانەی تووشی چەوساندنەوەی منداڵی بوونەتەوە، لە ژیانی خێزانیاندا دیسان دووبارەی دەکەنەوە).

**١- تۆ ئەوە دەڵێیت، کە پێت وتراوە!**

تۆ باوکایەتی، لە قوتابخانە فێرنەبوویت:

کاتێك منداڵەکانت لە دایك دەبن، دەبێت لە سەرەتاوە لە سفرەوە دەست پێ بکەیت، دەبێت خۆت ڕێگەکان بدۆزیتەوەو ئەوە هەڵەبژێریت، کە دەبێت ئەنجامی بدەیت، بەڵام نموونەیەکی ڕوونت لەپێش چاوە لاساییان بکەیتەوە. ئەویش: (دایكو باوکتە).

• من دڵنیام کەتۆ خۆت دەبینیتەوە لە ساتێکی تووڕەییداو هاوار دەکەیت، پاش ئەوە بیر دەکەیتەوە: (ئەی هاوار، خۆ ئەوە ئەوەیە کەباوکم لەگەڵمدا دەیکردو منیش ڕقم لێی بوو!) ئەو تۆمارە کۆنانە وەك (شۆفێری ئۆتۆماتیکی)وان بۆ تۆ.

• باوکانێکیش هەن بە دڵنیاییەوە، هەتاکو ئەو پەڕی لایەنەکەی تری دەڕۆنو زیادەڕەوی دەکەن، هاوڕێ لەگەڵ یادەوەرییە ناخۆشەکانی گەشەکردنیان سوێند دەخۆن کە هەرگیز سەرزەنشتی منداڵەکانیان نەکەنو لێیان نەدەنو هیچیان لێ حەرام نەکەن.

• مەترسیەکانیش لێرەوە سەر هەڵدەدەن لە زیادەڕۆییەوە، لەو حاڵەتانەشدا زۆرێك لەمنداڵان دەناڵێنن بەدەست لێنەپرسینەوەو بێسنووری، ئەمەش بێگومان کارێکی ئاسان نییە.

**٢-تۆ پێت وایە ئەوەی ئەنجامی دەدەیت ڕاستە!**

ڕۆژێك هەبوە ئەو بیروباوەڕە بڵاوە، کە منداڵان هەر لە بناغەوە خراپن، کاری تۆش ئەوەیە پێیان بڵێیت، تا چ ئاستێك خراپن، ئەمەش شەرمەزارییان دەکاتو پاڵیان پێوە دەنێت؛ بۆئەوەی باشتربن! پێدەچێت تۆش لەسەر ئەم ڕێگەیە پەروەردە بوبیت، زۆر بەسادەیی تۆ بیرت لە باسی ڕێزگرتن لە خود نەکردۆتەوە، یان منداڵەکانت پێویستیان بە هاوکاری تۆ هەیە؛ تاکو متمانە بەدەست بهێنن، گەر باسەکە بەم جۆرەیە، هیوادارم بیرکردنەوەت گۆڕابێت، پاش خوێندنەوەی ئەمە.

ئێستە پاش ئەوەی زانیت، دەمکوتکردنو سەرشۆڕکردن، چۆن دەبنە هۆی تێکشکانی منداڵ، من دڵنیام لەوەی کە تۆ دەوەستێنێت لە پەنابردن بۆ بەکارهێنانی.

(کاتێك پێویستت بە پارە بوو... گەر کاروباری سەرشانی قورسکردبوویت.... یان هەستت بەتەنهاییو بێزاری کرد.... گەر ناچار بوویت لە ماڵدا بمێنیتەوە...... لەو کاتەدا ئەوەی بە منداڵەکانتی دەڵێیت، بەرەو داڕووخانو تێکشکانیان دەبات).



# کێو بە کێو ناگات، بەڵام..

درەخشان بەهادین

سەردەمێك لە قەد پاڵی کێویکی بەرزدا، دوو ئاوایی هەبوون، کە یەکێك لە لای سەرەوەی کێوەکەو ئەوی تریان لە پێدەشتی کێوەکەدا بوو.

ئاوی کانییەکی سازگار سەرچاوەی ئاوی هەردوو دێیەکە بوو، کە لە ئاوایی سەر کێوەکە بەرەو ئاواییەکەی لای خوارەوە دەچوو، ئەم چاوگە، زەویی هەردوو لای تێر ئاو دەکرد. ڕۆژێکیان ئاغای دێی سەرەوە، کەوتە بیری ئەوەی کە چۆن بتوانێت ببێتە خاوەنی زەوییەکانی ئاواییەکەی خوار کێوەکە؟ ڕێگەیەکی دۆزیەوە، بە خەڵکی دێیەکەی خۆی گوت: سەرچاوەی ئاوەکە لە ناو ئاوایەکەی ئێمەدایە بۆچی ئەو ئاوە، هەروا بەخۆڕایی بە دێیەکەی خوارەوە بدەین، لەمڕۆ بە دواوە، ئاوەکەیان لێ دەگرینەوە.

یەك دوو ڕۆژ تێپەڕی، خەڵکی ئاواییەکەی خوارەوە، لە فکری بەدی ئاغا ئاگادار بوونەوە، هەر بۆیە لە گەڵ کوێخای گوندەکەیان، بەرەو ئاوایی سەر کێوەکە بەڕێ کەوتنو داوایان لێکردن، کە ئاوەکەیان بۆ بکەنەوە، بەڵام ئاغا کەی دێیەکەی سەرەوە، دوو ڕێگای بۆ پێشنیار کردن: یان دەبێت بڕۆنە ژێر دەسەڵاتی ئەوەوە، یان بۆ هەمیشە بێئاو دەمێننەوە، گوتی: "دێی سەرەوە، وەك ئاغا وایەو دێی خوارەوە، وەك ڕەعیەت، ئەم دووەش وەك یەك نینو هەرگیز بەیەك ناگەن، لە من ئاغاییو لە ئێوەش ژێرفەرمانیی من! دڵنیابن کە کێو بە کێو ناگات!

ئەم پێشنیارە، بۆ خەڵکی دێی خوارەوە، زۆر سەخت بووو، خەڵکەکە قەبووڵیان نەکرد. چەند ڕۆژ دواتر، کوێخای ئاواییەکەی خوار کێوەکە، ڕێچارەیەکی دۆزییەوە، بە خەڵکەکەی گوت: "پاچو خاکەنازەکانتان هەڵبگرن پێکەوە چەند جۆگەی ئاوو بیرێك لێ بدەن. دوای ماوەیەك جۆگەو بیرەکان پڕ بوون لە ئاوو خەڵکەکە دووبارە ئاویان بۆ زەوییەکانیان گەڕاندەوە. هەڵکەندنی ئەو چاڵە ئاوانە، بوو بەهۆی ئەوەی کە سەرچاوەی ئاوی دێیەکەی سەرەوە وشك بکات. ئەم هەواڵە گەیشتە ئاغاکە، زۆر نارەحەت بوو، چارەیەکی جگە لە ڕازیبوون شك نەبرد، هەر بۆیە بەرەو دێیەکەی خوار کێوەکە بە ڕێ کەوت بەتکاوە پێی گوتن: "ئێوە بەم کارەتان سەرچاوەی ئاوی ئێمەتان وشك کردووە، ئەگەر دەکرێت ئاوی یەکێك لەو بیرانە، بۆ دێیەکەی ئێمە بگەڕێنەوە."

کوێخا بەپێکەنینەوە گوتی:

"یەکەم: ئاو لە خوارەوە بۆ سەرەوە ناڕوات.

دووەم: بیرت دێت، کە وتت کێو بە کێو ناگات، تۆ ڕاستت وت. کێو بە کێو ناگات، بەڵام چاو بە چاو دەکەوێت. ئیتر دوای ئەم بەسەرهاتە، ئەم قسەیە بووە باسوخواسی سەر زمانی خەڵك، ئەم بەسەرهاتە بە سەرچاوەی ئەم پەندە دادەنرێت.



# چۆن خۆمان لە تەممەڵی بەردەوام ڕزگار بکەین؟

وەهاب حەسیب محەممەد ...... بینگۆڵ/ تورکیا

یەكێك لە گرفتەانی ژیانی سەردەم، كەم جووڵەییە، كە بەدوای خۆیدا چەندین ئاسەواری خراپو نەخۆشی لێ دەكەوێتەوە.

هەندێك پاشـكەوتنی ڕۆژهەڵاتییەكان بـۆ كەمی خڕۆكەی سـوور لە خوێنیاندا دەگەڕێتەوە؛ چونكە ئەوكارە هۆكارە لەوەی مرۆگەلـی ڕۆژهـەڵات تووشـی چەندین نەخۆشـی بێـت، واتە: جەستەی بەرگری كەم بێتو كەم تواناش بێت.

بەراورد بە دەوروبەر، كوردسـتانو نەتەوەی كورد لە هەموان پاشـكەوتووترە، واتە: ئێمە زیاتر لە دەرهاوسێكانمان پێویستمان بە جووڵەو خولخواردنە، تا قەرەبووی ڕابوردوو بكەینەوە، بەڵام كاتێكو بۆ تاوێك لە ژیانی گشـتی ڕادەمێنیت، تەواو پێچەوانەی ئەو ڕاسـتییە دەبینین. بەداخەوە، بە هیوام ئەم وتارە، هەوڵێك بێت بۆ ڕاچەنینمان لە خەوی بێداری.

ئەگـەر هەسـت دەكەیت، بەردەوام جەسـتەت بەشـێوەیەك قورسو گرانەو ناهێڵێـت چێژ لە ژیان وەربگریت، یان ناتوانیت ئیشـەكانت بەجوانی تەواو بكەیت؛ ئەوا ئەم بابەتە بخوێنەرەوە، چون دەوای ئەو دەردەیە!

**هۆكارەكانی هەستكردن بە تەممەڵی:**

هەسـتكردنی كەسـێكە بە ژانو ناسـۆریی بەردەوام، یاخود ئەندامێكی جەسـتەی بـەردەوام ئازاری هەیـە، كاردانەوەی ئەو دۆخە، ئەوەیە ئەو كەسـە تووشی دابڕان دەكاتو ئارەزووی هیچ چالاكییەكی نابێتو بەردەوام بێزارو ڕەشبینە.

**كاریگەریی خراپی ئەو بارودۆخە لەسەر ژیانی تاكەكەس:**

ئـەو كەسـە زۆرجـار تەممەڵی بەشـێوەیەك هاوسـەنگیو تەندرووستی سـەنگەلا دەكات، تووشی ڕەشـبینی دەبێت، كەسی دەردەدار توانـای خواردنـی نامێنێـت، هەمیشـە ئارەزوویەتـی بڕشێتەوە، دەتوانین بڵێین ئەو خواردنە سەرەكییانە ناخوات، كە لاشەی پێویستێتی!

بێگومان هەست بە تەممەڵی دەبێتە هۆی ئەوەی ئەركەكانت، لە كاتی خۆیدا تەواو نەكەیت، بەشـێوەیەك ئەمڕۆو سبەینێیان پێدەكەیت، تا بە یەكجاری پشـتگوێیان دەخەیت! ئەنجامەكەشی لە كاری پیشـەییتدا دوادە كەویـت، تەنانەت لە ژیاندا بەتەواوی تووشی شكستت دەكات.

بێ شك ئەوكارە، كاریگەری لەسەر ژیانی تایبەتیو خێزانیت دەبێت. لە كۆتاییدا كارێكت بەسـەر دەهێنێت، پێویستە سەردانی دكتۆر بكەیت.

**نەخشەڕێگای كارا بۆ چارەسەری تەوەزەلی:**

چۆن تەمەڵـی كاریگەری بەسـەر بارودۆخـی دەروونیتەوە دەبێت؟

بێگومـان تەوەزەلی، دڵتەنگی، تێکشـانو تێکچوونـی بارودۆخی دەروونیی کەسـی کەنەفتەکاری لێ دەکەوێتەوە، لە کۆتاییدا، توانای ئیشـکردنی نامێنێت، کاریگەری لە سەر تێڕوانینی بۆ داهاتوو، پلانو ئامانجەکانـی دەبێـت؛ چونکی ناتوانێـت تێڕوانێکی درووسـتی بۆ کارەکانی هەبێت، باوەڕیشی بە خۆی نامێنێت.

بۆئـەوەی لـەو بارودۆخـە ڕزگارت بێت، دەبێـت خاوبوونەوەو دواکەوتنـی ئیشـەکانت وەلاوە بنێیـت، بڕیـار بـدە هەرئێسـتا بۆ تەواوکردنی ئامانجەکانت تێبکۆشیت، ئەگەر هەستت کرد پێویستیت بەیارمەتییەکـی مەعنەوییە (وزەی ناخە)؛ ئـەوا داوای یارمەتی لە دەوروبەرت بکە، دڵنیا بە ئەوان یارمەتیت دەدەن.

هەروەهـا ژیانـی گەورەپیـاوان بخوێنـەرەوە، بزانـە چـۆن بەربەستەکانی ڕێگای ژیانیان تەخت کردووە. هیچکات لە ژینگەیەکی ناتەندرووسـتدا کار مەکە، بۆیە هەمیشە ماڵو نووسینگەکەت خاوێن ڕابگرە، وێنەیەکی شـادیبەخش لە دەوروبەرت دابنێ، دەتوانیت ئەو وێنەیە، لەپشتی جامی کۆمپیوتەرەکەت، یان مۆبایلەکەتەوە دابنێیت، خواردنی تەندرووسـت بخۆو بەتەواوی بخەوە، زیاد لە توانای خۆت کار مەکە، بەپێی خشتەو بەگوێرەی توانای خۆت ئیش بکە، هەندێك وەرزشی بەسوود بکە، وەك ڕۆیشتن بەپێ.

ئەگەر لایەنی دەروونیت، هۆکاری تەممەڵییە؛ ئەوا پێویسـتە بە دوای ئارەزوویەکی شادیهێنەردا بگەڕێیت؛ تا دڵو دەروونت ئارام بێتو توانای چالاکییت هەبێت، هەروەسا ئەگەر دەردەدارییەکەت پەیوەندی بە ناوماڵو خێزانەوە هەبوو؛ ئەوا پێویسـتە ئەو لاسەنگییەی ژیانت ڕاست بکەیتەوە، نێوانی خۆتو ماڵو منداڵت چاك بکەیتەوە.

ئەگەر بێتواناییەکەت پەیوەندی بەو کارانەوە هەبوو، کە زیاد لە تواناو تاقەتی خۆتن؛ ئەوا دەبێت ئەرکەکانت بەگوێرەی خشـتەیەك ڕێك بخەیت، بەشـێوەیەك ڕێکیان بخە، تا پەرۆشـیت بۆ ئەرکەکانت زیاتر بێت؛ بۆئەوەی بەئاسانی تەواویان بکەیت.

ئەگەر کەنەفتەکارییەکەت، پەیوەندی بە جەستەتەوە هەبوو؛ ئەوا لەم بارودۆخەدا، یەکەم ئامۆژگاریی ئێمە بۆ تۆ، ئەوەیە: بەشێوەیەکی پێویست بخەوە، بەو شێوەیەی ماسوولکەکانت پێویستیانە.

ئەگـەر نەخۆشـییەکەت ئەنجامـی زۆر ماندووبـوون بوو؛ ئەوا پێویسـتە چەند خولەکێك تا چەندکاژێرێك پشـووبدەیت؛ تا تواناو وزەت بۆ دەگەڕێتەوە. دواتر بە پەرۆشو چالاکییەوە دەسـت بدەیتە ئیشەکانت، هەروەها ئەگەر کارەکەت پێویستی بەوە هەبوو، چەندین ڕۆژی بۆ بدەیتە دەم شـەو؛ ئەوا پێویستە ڕۆژێك مۆڵەت وەربگریتو بە کەماڵی ڕاحەت پشوو بدەیت؛ تا جەستەت بەتەواوی دەحەسێتەوە.

ئەگەر توانای خواردنت نەمابوو؛ ئەوا تەنها ئەو خواردنانە بخۆ، کە جەسـتەت دەتوانێت تێکیان هەڵشـێلێت. لە خواردنی سـوورەکراو خۆت بپارێزە، چای لە تـەك زەنجەبیلدا بخۆرەو هێلکەو هەنگوین بخۆ.

لـە کۆتاییدا دەڵێین: ئەگەر ژانی جەسـتەت بەردەوام بوو؛ ئەوا سەردانی پزیشکی پسپۆڕ بکە.



# میزەڵدانی ڕەشو سپی

و: هەورامان محەممەد

لەپارکێکدا منداڵێکی ڕەش پێست سەیری پیاوێکی میزەڵدان فرۆشی دەکرد، کەوا دەردەکەوت فرۆشیارییەکی میهرەبان بێت.

پیاوە میزەڵدانە فرۆشـەکە بۆ ڕاکێشـانی سـەرنجی خەڵکی بۆلای خۆی میزەڵدانێکی زەردو دواتر میزەڵدانێکی سپی هەڵدا.

میزەڵدانـەکان بـە هێواشـی بەرەو ئاسـمان چـوونو بەرز بوونەوەو دیار نەمان.

منداڵە ڕەش پێستەکە هێشتا وەسـتا بوو واقی وڕمابوو بە دیار میزەڵدانێکی ڕەشەوە.

تـا بەرە بـەرە لـە میزەڵـدان فرۆشـەکە نزیك بـووەوەو بـە دوودڵییەوە لێی پرسـی: ببـورە بەڕێز! ئەگـەر میزەڵدانە ڕەشەکەشـت هەڵبدایـە ئایا بەرز دەبـووەوە؟ پیـاوە میزەڵدان فرۆشـەکە پێکەنیو بـە دان ئەو پەتەی پچڕانـد کە میزەڵدانە ڕەشـەکەی ڕاگرتبوو میزەڵدانەکەش بەرەو سەرەوە بەرز بووەوە، دوای کەمێك وتی: "ئەو شـتەی کـە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی میزەڵدانەکە ڕەنگەکەی نییە، بەڵکو ئەو شـتەیە کە لەناو خودی میزەڵدانەکەدایە"!

ئەو شـتەی کـە ئەبێتە هـۆی گەشـەکردنو بەرزبوونەوەی مرۆڤەکان ڕەنگو ڕوخسار نییە...

ڕەنگەکان... جیاوازییەکان... گرنگ نین...

گرنـگ ناخی مرۆڤـە، ئەوەی کە لەناخـی مرۆڤەکاندایە جێگەو پلـەو پایەیان دیـاری دەکاتو هەتا ئەوەی کەلەناخـی مرۆڤەکاندایە بەبایەخترو باشتر بێ پلەو پایەیەکی فراوانترو شایستەتریان ئەبێ.

-هەرکارێـــك کەلە توانامدا بوو کـــردم بۆ کچەکەم.تابتوانێت خوێندنەکەی تەواو بکات و ببێتە کەسێکی سەرکەوتوو.بەڵام ئەو بـــە غرورو ســـەرپێچیەکانی خۆی بێچارە کـــردوو ئایندەی خۆی ڕەش کرد.

ئەمانە بەشـــێك بون لە دەردە دڵی باوکێکی دڵشکاو،کەلەگەڵ کچەکەیدا هاتبونە دادگای مشـــهد بۆتۆمارکردنی ســـکاڵا لە سەر زاواکەی.توێژەرەکە داوای لە شیوا کرد تا بەسەرهاتی ژیانی خۆی بۆ بگێڕێتەوە.

-باری ئابوری خانەوادەکەم زۆر باشبو .دایك و باوکم لەپێدانی خۆشەویســـتی بەمن و منداڵەکانی تریان درێغی یان نەکرد.بەڵام من نەمتوانی وەڵامی ئەو خۆشەویســـتی یەیان بدەمەوە.ســـاڵێك لەمەوبـــەر کاتێك خۆم بۆ کۆنکور ئامـــادە دەکرد،کەوتمە داوی خۆشەویســـتی کوڕێکەوە.هەمـــوو ڕۆژێك لە ڕێگای کلاســـەکەمدا یەکترمان دەبینی و ماوەیەك قســـەمان دەکرد.پاش تێپەڕ بوونی ماوەیـــەك کاتێك نیما زانیی کەباوکێکی دەوڵەمەندم هەیە زیاتر هۆگـــر بوو پێمەوە.ماوەیەکی کەمی پێچوو لەگەڵ خانەوادەکەیدا هاتـــە خوازبێنیم.بەڵام دایك و باوکم بەتوندی بەرهەڵســـتی ئەم هاوســـەرگیریەیان کرد.دەیان وت کوڕێك کەتەنانەت دیبلۆمی نی یـــە و هیچ کارێکـــی نی یـــە ناتوانێت ماڵ ببـــات بەڕێوە.منیش هەرچەنـــد ڕێـــزی زۆرم بۆ دادەنان و ڕای ئـــەوان زۆر گرنگ بو بەلامەوە.بەڵام لەبەرئەوەی فریوم خواردبو بە قسە بریقەدارەکانی نیما هەرلەســـەر قسەی خۆم ســـوربوم .دەمویست بە هەر ڕێگەو نرخێك بێت ئە وهاوســـەرگیریە سەربگرێت لە نزیکترین کاتدا. لەبەرامبەریشـــدا خانەوادەکـــەم تادەهات زیاتر بەرهەڵســـتی ئەم کارەیان دەکرد.تاکار گەشـــتە ئەوەی کە هەڕەشـــەی خۆ کوشتنم کـــرد ئەگەر بۆ نیما نەبم.دایك و باوکیشـــم بەو هەڕەشـــانەزۆر نیگـــەران بـــون و ناچاربون ڕازی ببن.ئاهەنگی هاوســـەرگیریمان زۆر بەشـــکۆوە بەڕێوەچوو.هەرچەند وام دەزانی کەبەسوارچاکی خەونەکانم گەشـــتوم.بەڵام بەداخەوە دوای دوومانگ زانیم کە چ هەڵەیەکی گەورەم کردووە؟!

چیرۆکەکـــە لەوکاتەوەدەســـت پێـــدەکات دوای ئـــەوەی کەبە هاوکاری باوکم نیما کاری پەیدا کردو ژیانی هاوبەشمان دەگوزەراند لـــەو خانووەی کەدیاری باوکم بو بۆ من.باوکم گرانترین مۆدێلی ئۆتۆمبێلـــی بۆ نیما کڕی تالـــەلای هاوڕێکانی دلگیر نەبێت.بەڵام نیما ئەو کەســـە نەبوو کەمن خەونم پێیەوە دەبینی.ئەو کەسێك بوو کەهەستی بەبەرپرسیاری خێزانداری نەدەکرد .وەکو کوڕێك هەڵـــس و کەوتی دەکرد و تـــەواوی کاتەکانی لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەســـەردەبرد.کەدیارنەبوو لەکوێوە هاتون و چ کارەن؟ من چەند جار تکام لێکرد کەلەبەر پاراســـتنی ژیانی هاوبەشـــمان و ئابڕوی خانەوادەکانمـــان واز لەوجۆرە کارانە بهێنێت.چەند جار پێم وت کەپێویســـتە وە ك و پیاوێك ڕەفتار بکەیت و شـــەوان زوبێیەوە ماڵەوە چونکە کەسێك چاوەڕوانتە.بەڵام بێ سودبوو.

دوێنێ بۆ ســـکاڵا کردن ڕۆشـــتم بۆ ماڵی باوکـــی نیماو داوام لێکردن کەئامۆژگاری کورەکەیان بکەن.بەڵام لەوەڵامدا وتیان ئێمە لـــە کوڕێك بێزارین کەلەبیری چـــووە کە خانەوادەیەکی هەبێت. بڕۆ خۆت کێشـــەکەت چارەســـەر بکە.بەبیســـتنی ئەم قسانە زۆر دڵتەنـــگ بوم و بەچاوی پڕ ئەشـــکەوە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.بەڵام کاتێك کە چومە ماڵەوە بۆنێکی نامۆم هەســـت پێکرد.بەهێواشی ڕۆشـــتمە ژوری دانیشـــتن و بینیم نیماو دو هـــاوڕێ ی خەریکی کێشـــانی مادەی ســـڕکەرن.هاوڕێکانی کەمنیان بینـــی بەخێرایی ڕایـــان کـــردوو خۆیا ن ون کرد.لەوکاتەدا مـــن بەنیمام وت ئەمە چ حاڵێکە کەتۆی تێدایە؟بەڵام ئەو مەســـت بوو ڕوخســـاری سور هەڵگەڕابو،ڕۆشـــتە چێشـــت خانەو چەقۆیەکی هێنا تا بمکوژێت. منیش بەپەلە ڕامکردو خۆمم ڕزگار کرد.

شیوا ئەشکەکانی سڕی و وتی:

-دەمەوێ لێی جیاببمەوە...ئێســـتا لەمانای قســـەکانی باوکم تێدەگـــەم کەدەیوت دەبێت پیاو توانای ژیانی هەبێت.بەڕاســـتی کـــەس ناتوانێت بەڕوخســـار کەســـێك بناســـێت.داوا لـــە هەموو گەنجێـــك دەکەم لەکاتی هەڵبژاردنی هاوبەشـــی ژیاندا تەنها بە ســـۆز بڕیار نەدات،ئەو ســـۆزە هەڵگرێت بۆ دوای هاوسەرگیری. وەپێـــش بڕیـــاردان لێکۆڵینـــەوەی تـــەواو بـــکات و ڕای هەموو ئەندامانی خانەوادەکەی وەربگرێت.




زریان مەحموود



بێگەرد فارس

# گوللەی وێڵ بوونی نییە!

چەند ساڵێك پێش ئێستە، لە یەكێك لە بازاڕەكانی دیمەشق، دوو كەس بوو بە ناكۆكیو دەمەبۆڵەیان، پاشان هەردوولا بەردەوام بوون لە شەڕكردن، یەكێك لەوانە دەمانچەی پێ بوو، هەوڵی دا ئەوەی لەگەڵی بەشەڕ هاتووە، بكوژێت، بۆیە فیشەكێكی بەرەو ڕووی تەقاندو نەیپێكا، بەهۆی ئەم دەنگە دەنگەوە، پیاوێك لە دوكانەكەی خۆی سەری هێنایە دەرەوە؛ بۆئەوەی بزانێت چی ڕوو دەدات، لەو كاتەدا ئەو فیشەكەی تەقێنرا بەر ملی كابرای دووكاندار كەوتو یەكسەر ئیفلیج بوو!

ڕۆژێك كابرایەك، بانگخوازی بەناوبانگی سووریا: شێخ موحەممەد ڕاتب نابلسی دەبینێتو لێی دەپرسێت: تۆ هەمیشە باس لە دادوەریی خودای گەورە دەكەیت، ئایا دادوەریی خودای گەورە لە چیدایە، لە كاتێكدا كەسێكی بێتاوان دەیەوێت بە كاركردن ماڵو منداڵی بژیەنێت، بەهۆی ناكۆكی دووكەسەوە ئیفلیج دەبێت؟!

شێخ موحەممەد نابلسی دەڵێت: بە كابرام گوت: من دڵنیاو بێگومانم لە دادپەروەریی خودای گەورە، بەڵام دیارە شتێك هەیە، ئێمە نایزانین، تەنها خودای گەورە دەیزانێت.

پاش بیست ڕۆژ، هاوڕێیەكی شێخ ڕاتب نابلسی باسی ڕووداوێك دەكاتو دەڵێت چەند منداڵێكی هەتیو، سكاڵای ئەوەیان لەلا كردم، كە مامیان لەبەشی میرات، كە هی باوكیان بووە، بێبەشی كردوونو مافی ئەوانی خواردووە، منیش داوام لێ كردووە كە مافی هەتیوەكان بگێڕێتەوە، بەڵام ئەو نكوولی لێ كردووەو نیازی ئەوەی نییە، ئەو بڕە پارەیەی كە هی خۆی نییە، بگێڕێتەوە بۆیان، دەڵێت: منیش پێم گوتن: ڕۆڵەكانم، ئەوە مامتانە شتێكی جوان نییە، بیدەنە دادگا، بەڵام بیدەنە دادگای خودای گەورەو سكاڵای خۆتان بەو بسپێرن، ئەم ڕووداوە كاتژمێر ٨ی ئێوارە ڕووی دا، بەیانی كاتژمێر ٨ی بەیانیش مامیان لەكاتێكدا لەو بازاڕەی ئەو كاری تێدا دەكات، بەهۆی دەمەقاڵەی دوو كەسەوە سەر لە دوكانەكەی دەهێنێتە دەرەوەو گوللەی وێڵ بەر ملی دەكەوێتو بەو هۆیەوە ئیفلیج دەبێت!

شێخ ڕاتب نابلسی دەڵێت: شتێك نییە بە ناوی گوللەی وێڵ، بەڵكو هەمووی بەهۆی حیكمەتی خودای گەورەوەیە، هەركەسێك تووشی هەربەڵاو موسیبەتێك ببێت، بێ حیكمەت نییەو بێ هۆ نییە خودای گەورە، خۆی مامەڵە دەكات لەگەڵ هەرحاڵەتێكدا كە بەسەر بەندەكانی بێت، ئەمە لە لایەك لە لایەكی دیش، پێویستە هەموو ئەوە بزانین، كە خواردنی مافی كەسانی تر، تاوانێكی گەورەیە، چجای ئەوەی ئەوانەی مافیان بخورێت، بێباوكبن، بەدڵنیاییەوە هەرشتێك كە تۆ دەستی بەسەردا دەگریت، بێ ویستی خۆت لێت دەسەنرێتەوەو نابیتە خاوەنی، ئەگەریش بوویتە خاوەنی، بێگومان دەبێتە ئاگرێكو دەتسووتێنێت.

Top story



# بەڵای زوبان

کیژان فەرەج

**دەردی جوانییە: پێوەندی پێی گوڵ**
**بەڵای زبانە قافەسی بلبل (پیرەمێرد)**

ئازیزم گەر زمان نەبوایە، بولبول جێی چ بوو لە قەفەزدا؟ گەر جوانی گوڵ نەبایە، کوا گوڵ هێندە پێوەند دەکرا؟

ڕەنگە درۆ نەبێژم، گەر بڵێم: مێشکمان خەریکە وەڕەس دەبێت لێمان، واهێندە چاومان خستۆتە پێشیو ئەومان وەلاناوەو ڕۆژانە چەندین شت، لە چواردەورمان دەبینینو بێ مۆڵەتخواستن لە مێشکمان هەموو بڕیارێکی بەسەردا دەدەین!

کچێکی جوان دەبینین، بێ بیرکردنەوە ئاوات دەخوازین بەوەی: ئای بریا هێندەی ئەو، چاوم گەورە دەبوو، ئای خۆزگە هێندەی ئەو باڵام بەرز دەبوو، ئەوکات زۆۆۆر جوان دەبووم!

بەسە ئیتر هێندە بیرکردنەوەمان لەوەی، ئای خۆزگە هێندەی هاوسێکەمان دەوڵەمەند دەبووین، هێندە بە ئاخی بێپارەییەوە سەر بنێینە سەر سەرین، خەوەکانیشمان بە ژماردنی پارەوە بەرینە سەر!

بەسە چیتر، ئاواتخواستنمان بەوەی خۆزگە وەك هاوڕێکەم، بنەماڵەیەکی ناودارو بەناوبانگمان دەبوو، ئەوکات هەموو کارێکمان بەباشی دەڕۆشتو خەڵکی ڕێزی زیاتریان لێ دەگرتین!

* ئازیزم، نازانم تاچەند هاوڕایت لەگەڵمدا؟ بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕۆژێك دێت هاوڕا دەبیت لەگەڵمدا کە: هەموو ئەو بەخششانەی باسمان کردن، شتانێکی ڕووکەشن، ناوەڕۆکێك هەیە، لە هەموو ئەوانە گەورەترە؛ چونکە هەریەك لە جوانیو سامان بنەماڵە، لە کۆتاییدا وەك بولبولەکە، ژیانێکی قەفەزئاسات بۆ درووست دەکەن؟

ئازیزم، هەر ئەو کچە هاوڕێیەت، کە هەموو کات ئاواتمان پێ دەخواست، هێندەی ئەو جوان بوینایە، ئێستا بۆتە بەدبەخترین هاوڕێت !چونکە بەهۆی جوانییەکەیەوە، هاوسەرگیری لەگەڵ کوڕێکدا کردووە، هاوشانی خۆی جوان بێت، بێ بیرکردنەوە لە کەسایەتییەکەی.. لە دواییدا بۆی دەرکەوتووە، کە ئەم کوڕە بەهۆی کارە خراپەکانییەوە، تەنانەت لە کارەکەشی دەریان کردووە، بە هۆی دڵپیسییەکەیەوە، هاوڕێکەی تۆی هاوشێوەی تاوانبارێکی زیندان بەند کردووە!

هەر ئەو هاوسێ دەوڵەمەندەی، هەموو کات ئاواتمان بە جێگەی دەخواست، دوای بیستنی ئەوەی فەشەلی هێناوە لە کارەکەی، سەکتە لێی داوەو ئێستاماڵی بۆتە نەخۆشخانە.

ئەو هاوڕێیەشمان، کە ناوداربوو، یەکێك لە ئەندامی ئەو بنەماڵەیە، کارێکی قێزەونی کردووەو بەو هۆیەوە ئێستا بۆتە سەرشۆڕ لەناو خەڵکیداو ناوێرێت بڵێ سەر بەو بنەماڵەیەم، لە کاتێکدا جاران هەموو کات باسی دەکرد.

ئازیزم، بینیت!! هەموو ئەمانە ڕووکەشن، ئەوەی ناوەڕۆکی شتەکانەو شایەنی ئەوەیە هەمووومان ئاواتی پێ بخوازین، بریتییە لە: مانەوە لەسەر ڕێگای ڕاستو نزیکییە لە خودا.

* نەکەی ناسوپاسگوزاربیت، لە دڵەوەو بڵێیت: خۆزگە چاوم ڕەش نەبوایەو سەوز، یان قاوەی دەبوو، لەیادت بێت چەندین کەس بە ئاواتی چاوێکەوەن؛ تاکو پەڕتووکەکەی خودای پێ ببیننو بەچاوی خۆیان بیخوێننەوە؛ تا ژوانی سرووشتی پێ بینو بۆ تەنها جارێك، ڕەنگی ڕوخساری خۆیانو خۆشەویستانیان ببینیایە!

* بێزار نەبیت لەوەی، گەر ڕۆژێك کیفی پارەکەت پارەی کەمی تێدا بێت؛ چونکە ڕەنگە چەندەها کەس هەبن، پارەی کیفەکەشیان نەبێت!

* ئاخ هەڵنەکێشیت لەوەی بریا خاوەن ناوبانگو بنەماڵەیەکی باش دەبووم؛ چونکە ڕەنگە هەزاران کەس هەبن، نەزانن ناوی دایكو باوکیشیان کێیە؟!

ئازیزم، گلەیی دڵت لە کێ دەکەیت؟؟؟؟!!!! لەو خودایەی دادپەروەرترینە؟ لەو خودایەی بەخشێنەری هەموو بەخششەکانتە؟ کە تا ئەم ساتەش، نەمانتوانیوە سوپاسگوزاری هەناسیەکیشمان بین، کە پێی بەخشیوین..

((با لە ئێستا بەدواوە، وشەی (بریا)کانمان بگۆڕین، بۆ بڕیاری خۆتە خودایە، پڕ بە دڵ سوپاسگوزارتین))



# ئەم زستانە

سایە سەرگەتی

بەم زستانە، منداڵانی دەوروبەری شار، بەهاریانە.. بەهاری ناخی خۆیان، ئەوان بەهارانە بیر دەکەنەوە، بەهارانە دەژین، وەرزەکان، ڕووداوەکان، مەترسییەکان، سرووشتی منداڵانی دەوروبەری شار تێك نادات، لەژێر نمەنمەی باران، خەونەکانیان گەشە دەکات، زۆر زیاتر لە بەرزیی باڵایان، ئەوان تۆوەکان بۆ بەهاری داهاتوو دەنێژن، بە لەدایکبوونیان زۆرخۆشحاڵ دەبن، بەڵام کەمێك شەرمن، وەك شەرمی گوڵێکی یەکەم بەهارە، ڕوومەتی منداڵەکان پەمەیی دەبێت، بە دەستە بچووکەکانیان، ڕووەکە نوێیەکان ئاو دەدەن، چەند عاشقانە، هاوڕێ بۆ خۆیان پەیدا دەکەن تا لەگەڵیاندا گەورە بێت، دەستەکانیان ڕوو بەئاسمان، نزای مانەوەی هاو عەشقەکانیان دەکەن، ئەوان ئاسوودەن، لە ڕووخانی دیوارەکانی ژیانیان، ناترسن، هەمیشە بیریانە، کە بەهۆی چاکەی باوکیانەوە، ڕەحمەتی خودا بەردەوامە. کاتێ کەشتییەکانیان نزیکی غەرقبوونە، بیریانە، کە خودا لەو پادشا ستەم کارە دەیانپارێزێت، کە کەشتییە نوێیەکان داگیر دەکات، کاتێك کە خۆشەویستەکانیان لەدە ست دەدەن، ئاسوودەن، خودای مەزن، چەندین عەشقی بێوێنەی بۆ بڕیارداون، منداڵانی دەوروبەری شار، هەرگیز پرسیار لە خودا ناکەن، نهێنییەکانی نێوانیان دەپارێزن، دڵنیان، پادشای پادشاکان، بەڕێوبەری کارەکانیانە، بۆ هەموو بڕیارەکانی خودا، دەڵێن، گوێبیست بووین: جێبەجێی دەکەین.

لە وتەکانی زۆربەی مرۆڤەکان تێناگەن؛ ئاخر ئەوان، یاری ڕووناکی خۆرو گوڵە بەهارییەکانی سەر دۆڵەکەن، عاشقی بۆنی خۆڵی سەربانی خانووە بچووکەکەن، سەرسامی جووڵەی زیرەکانەی ئەو گەڵایەن، کە تازە لە قەدی دایك جیابووەتەوە. چەند بەڕێزن، بەرامبەر هەموان، چەند دڵسۆزن، بەرامبەر ئەو وتانەی کە بۆ ئەوانە، شکۆی تەواوی ئەو وشانە ڕادەگرن، کە دژی ئەوانە، بەڵام خۆیان زۆر کەم وتە ئاڵتوونییەکانیان بەکار دەهێنن، دەڵێن: بۆ خۆشەویستان، وتەکانی دڵ بەسە، ئەو کەسانەش بێزار ناکەین، کە بە ئێمە نائاسوودەن. هیچ کات شەڕ بۆ بەدەستهێنانی دڵەکان ناکەن، وەك ئاو، نەرم نەرم دەچنە ناو ناخی دڵەکانەوە، دەڵێن: ئێمە داوا لە خاوەنی لێدانی دڵەکان دەکەین.

چەند کەمن، منداڵانی دەوروبەری شار، بەڵام سەیر بکە، تۆ ئەوان دەناسیت، تەنها دەبێ هەستیان پێ بکەیت، هەستیان پێ بکە؛ تا ئارامیی دەوروبەری شار لەبیر نەکەیت؛ تا لەگەڵ هەژاریی ئەواندا ڕێ بکەیت، دەنگی گریانی منداڵە ئاوارەکانت لەبیر بێت، چاوە جوانەکانی شوانە بچووکەکەی لادێت لەبیر بێت، بەم زستانە، بەردەوام بە لەژیان، ئەوانت لەبیر بێت، ئەی خاوەنی میهرەبانترین دڵو ئارامترین هەست.

یان مەیەو با هەر تەنیا بم......،

یا کە هاتی، ئیدی ژاری بێتۆییم دەرخوارد مەدەو لە بیابانی تەنیاییدا، جێم مەهێڵە!

چی دەبێ، ئیدی نەڕۆی؟!

دە تو خوا، ئیدی مەڕۆو لە خۆشترین خەوی تەمەنم، وەئاگام مەهێنەوە!

دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە، ئەی حەبیبە
وا بزانە، خوێنی خۆمە، یا مینەتی ڕەقیبە -نالی-

نەدەکرا، کە هاتی، ئیدی هەرگیز نەڕۆی؟

نەدەکرا، ئیدی بەماڵئاوایی نەمخنکێنیو چیدی ئازاری ڕۆحم نەدەی؟!

دەزانی، هاتنی تۆ، بەهەشتی نەبڕاوەی دڵی منە...؟

بۆ دەبێ هەموو جار، دوای ئەوەی بە فیردەوسی خۆم شاد دەبم، لەبەردەم دەرگای دۆزەخی تەنیاییدا، بەتەنیا جێم بهێڵی؟

دەستم دامێنت، چیدی مەحرووم مەکە لە خۆت!!

مەمخەرە هاویەی هەولی فیراق
دەستی من دامەنی تۆ ڕۆژی قیا -نالی-

دەزانی، ئەو ساتانە چەند سەختن، کە ڕۆحم تۆی دەوێتو تۆش ئامادە نیت؟!

هەڵبەت چاك دەزانی، «تۆم دەوێت» یانی چی!

چونکە ئەوە، هاواری هەمیشەیی منە!

ئەو دڵەی من، چەند بەستەزمانە! شەوانە چۆن دەتوێتەوەو لەگەڵ ئەسرینی چاوەکانمدا، ئاوێتە دەبێت!

دڵم وەك شێری بێشەی شوعلەگرتوو
لە سینەی پڕ لە سۆزم، دەربەدەر کەوت -مەحوی-

شەوانە بێ بۆنی عەبیرت ئەی گوڵەندام،

بێ چرپەی وشە ناسکەکانت، غوربەت خەریکە دەمکوژێ!

شەوانە هێندە دەگریم، چرای ژوورەکەشم هاوشینمە!

چرا ئەمشەو، کە وا فرمێسك ئەڕێژێ
ئەڵێی هەر بۆ منی پەروانە ئەگری -بێخود-

سەختە ژیان لە شارێکا، کە داروبەردی بۆنی تەنیاییو بێتۆیی لێ بێت!

سەختە ساتەکانی تەمەن، هەموو چاوەڕوانیو حەسرەتی دیدار بن!

ئەستەمە ڕۆژ تا ئێوارە، چاولەڕێی هاتنی تۆ بمو نەتوانم دەست لەو چاوەڕوانییە هەڵگرم.

پەرێشانم لە حەسرەت دەردی دووری
بە لوتفی خۆت بدە یارەب، سەبووری -بێخود-

من جگە لە ڕێگای نێو دڵی تۆ، ڕێگایەك نازانم، پێم سەیرە چۆن ئێواران، دەتوانم بگەڕێمەوە کوڵبەی ئەحزانم!

لەنێو بۆنی کتێبو پێنووسو هەموو پەڕەی نامەکانتدا، جگە لە بێتۆیی، هاودەمێکم نییە!

ئێستا دەزانی، کە پێم دەگوتی: بێتۆیی کوێری کردم...

مانای چی بوو؟!

گڕی دووریت، ناخی هەڵپڕووکاندبووم! دەمردم بۆ وشەیەکت!

خەندە ئەفسووناوییەکەتم، بەسەر سەودا دەکرد!

بە ئاوات بووم، یەك چرکە، بێمە حزوورت، خۆزگە بەو کەسەی دەتوانێ هەرکات ویستی، تێر تەماشات بکات!

خۆزگەم بەوەی لە دووی تۆ، هەر دەڕوانێتە ڕووی تۆ
مردم بە ئارەزووی تۆ، قوربانی ئاشناتم -وەفایی-

خۆ هەرچەندە ڕۆیشتنت مەرگو مردنە بۆ من، وەلێ هیوای هاتنەوەتو تەشریفی دووبارەت، جارێکی دی ڕۆحی مردووم، دێنێتەوە سەما!

دێیتەوەو پڕ سینەم دەکەی لە گوڵاو..

دێیتەوەو هەموو کووچەو کۆڵانی عومرم، گوڵباران دەکەیتو ئاوێزانی ڕۆحم دەبی!

ئای لە سەختیی ئەم چاوەڕوانییە، ئای لە خۆشیی هەواڵی هاتنت.

کە شەو بەیانی بەردا، گوڵ وەنەوشە باری
سەلای بە عاشقان دا، باغی گوڵو هەناری -وەفایی-



# تەنیایی!

کەرمیانی

شەوی هیجرو بەقای عومری ڕەقیبم
خودا تەی بێ، خودا تەی بێ، خودا تەی
-نالی-



# نامە نوورییەکان

## نامەی چل و نۆ

مامۆستای ئازیزم، وشە بە وشەی نامە پرشنگدارەکەتم، لە گوێدا دەزرنگێتەوە.....

ئێستا هەست دەکەم کە چی لێپرسراوێتییەکی گەورەم لەسەر شانە!

ئێستا هەست دەکەم، موسڵمانی خاوەنپەیام و پەروەردەی ڕاستەقینە، کەشتی نووحەو دەبێت هەوڵ بدات، زۆرترین ژمارەی مرۆڤەکان، لە خنکانو نوقمبوون ڕزگار بکات!

دەستیان بگرێت؛ لە تووڵەڕێوە، بۆ شارێی ئیسلام!

لەنێو دەیجووری ڕەشەوە، بۆ نێو دەریای نوورو چلچرای ئیمان!

ڕۆژانە دەبینم، دەستە دەستە خوشکو براکانم، وەك پەپوولە، خۆ دەهاونە نێو گڕی ئاگرو هەڵدەقرچێن!

پەیتا پەیتا، لە ئایینی بەرزو لە پەیامی نوورینی خۆیان دوور دەکەونەوەو لە شیرینیو لەزەتی ئیمانو نزیکی لە خوداو سۆزو میهرەبانیی خودایی، خۆ مەحرووم دەکەن!

نازانن ئیدی لەو نووره ئیلاهییە زیاتر، نوورێکی دی نییە! ﴿ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ ﴾ النور:٤٠

نازانن چەندە جیاوازە: ڕێگای ڕاستو ڕێگای نادیار! ﴿ أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِ أَهْدَىٰ أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الملك: ٢٢

نازانن ڕێزو گەورەییو شکۆمەندی، تەنها خودا دەیبەخشێو ئەوەی خوداوەند ڕێزی پێ نەبەخشێ، ئیدی هەرگیز پلەوپایەیەك بەدی ناکات..... ﴿ وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ ﴾ الحج:١٨

ئازیزم، خۆشحاڵم کە ئێستا پێگەی خۆت زانیو لە ڕۆڵی گرنگو بێوێنەت ئاگادار بووی!

تۆ هەڵگری چرای نبوەتو سەدای ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴾ی.. تۆ زایەڵەی ئاوازی «أمتي، أمتي» دواهەناسەکانی ژیانی سەروەری!

تۆ چرپەی ڕۆحی «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ»ی!

تۆ شەونمی گوڵاوی گوڵشەنی «إِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ»ی!

تۆ کەیلی بۆنی میسکی نێو دەستی ئاوریشمینی موحوممەدو پەروەردەی شەکرە وشەی لێوی بەخەندەی ئەحمەدی!

تۆ پەروەدەی «يسّروا ولا تعسّروا»ی!

چاولەقاپیی ئەو پەروەردگارە مەزنەی کە دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَفْعَلُ اللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَآمَنتُمْ ﴾ النساء: ١٤٧

تۆ هیوای، لە زەمەنی بێهواییدا، باوەشی سۆزی، لە زەمەنی بێمیهریدا، خۆشەویستیت، لە زەمەنی ڕقو کینەدا!

پارووی نانی، لە زەمەنی هەژاریدا! دەستی میهری لە زەمەنی زوڵمو ستەمدا! پاکیو عەفافی، لە سەردەمی تاوانو گوناها!

سیمای فریشتەی لە سەردەمی ئەهریمەندا!

ئارامیو هێلانەی پشووی، لە زەمەنی دڵەڕاوکێو نیگەرانیو ترسدا...

دەبا ئازیزم، ئێمە هەتوانی برینو کازیوەی بەیانو سروەی بەهارو خۆری هیواو باوەشی ئەوینی خودایی بین!

مرۆڤەکانی دەوروبەرمان ماندوون، شەکەتن، گرفتارن، ڕاستیو حەقیقەتیان لێ ون بووە!

گومانو ئارەزوو، باقوبریقی دونیا، دەستی ناوەتە بینەقاقایان! بۆ گەیشتن بە بەختیاریو کامەرانی، ڕێگای زۆریان تاقی کردەوە، بەڵام هەمووی سەراب بوو!

ماددەپەرستیو ڕاکردن بە شوێن ئارەزووەکاندا، ڕۆحی کوشتن!

با جارێکی دی، بە خودای گەورەیان ئاشنا بکەین، لەسەر خوانی پیتە زێڕینەکانی قورئان کۆبینەوە!

با بە ئاوی دەستنوێژ، تەپوتۆزی خەمو پەژارەو نەهامەتییان بسڕینو دڵەکانیان بکەینە یەك ڕووگەو دەستەکانیان بەرەو ئاسمان بڵند بکەین؛ تا لەوێدا، جارێکی دی خۆیان بدۆزنەوە، جارێکی دی تامی ژیان بکەنو هەست بکەن کە هەموو خۆشیو لەزەتەکانی دونیا، ناگاتە لەزەتی یەك سوجدە بۆ پەروەردگار!

پێشیان بڵێ ئازیزم:

خودا خۆشحاڵە بە گەڕانەوەتان، خودا خۆشی دەوێن، خودا دەرگای میهری لەسەر پشتەو بەردەوام پێیان دەفەرموێ:

﴿ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ النور: ٣١

# لەگەڵ پاکی شاعیردا




شاعیر، ناوی مەلا تاهیری کوڕی مەلا مەعرووفی ڕەباتییە، ساڵی ١٨٩٦ لەدایك بووە.

پاکیی شاعیر، زانایەکی شارەزاو خۆشنووسێکی بەهرەمەندو ڕۆشنبیرێکی زمانپاراوو عابیدێکی خواناسو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزو چاکخوازێکی کۆمەڵایەتی بووەو خاوەنی دیوانێکی شیعریو کۆمەڵێك نووسینو وەرگێڕانەو شارەزایەکی باشی زمانەکانی عەرەبیو فارسی بووە. شاعیر، ساڵی ١٩٨١ کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی گوندی «قورشاغلو» لە باشووری شاری هەولێر، بەخاك سپێردراوە. ئەمەش دوو نمونە لە شیعرەکانی:

*** *** ***

خەیاڵــی وردەخاڵی ســەر دوو کوڵمەی جانــی جانانم
ڕفانــدی خــەو لە دوو چاوم تەماشــا حاڵی پەرێشــانم
هەتاکەی دەمکوژی قوربــان، لە هیجری ڕووی گوڵنارت
بکە دەرمانی زەخمــی دڵ، ئەتۆی هەم دەردو دەرمانم
ســەلامی مــن، لــە کزەبــای نەســیمی دەم بەیانی بێ
کە هێنای بۆ مەشــامم، بۆنی مەزاری شــاهی شــاهانم
بەتیری عیشــقی تــۆ دیــارە، دڵو جەرگــم زەخمدارە
لەخــۆڕا، تاکــو ئێــوارە، لــە ناڵــەو شــینو گریانــم
ئەگــەر ڕوخســاری، بنوێنێتــە بەرچــاوی جیهانبینم
حەیاتــی جاویدانیــم پــێ دەبەخشــێ، جانــی جانانم
لە دووریی ڕووی گوڵناری، لە چاوم ئەشکی خوێن جاری
ئیتــر قوربــان، بکــە ڕەحمێ بــە چاوی ئەشــکڕێزانم

*** *** ***

ئــەی بەشــەو ڕووماهــی بــەدرو وەی لــە ڕۆژا ئافتــاب
دڵ لــە شــەوقی ڕووت ئەســووتێ، وەك کەتــانو وەك کەبــاب
هەرکەســێ گــەر پرتەوی ڕوخســاری تــۆی دی ســەد عەجەب
ئــەو لــە دوو چــاوی نەڕێــژێ، ئەشــك وەك شووشــەی گوڵاب
گــەر ئەتــۆ بێــی، بمکــوژی بێســووچو قەباحــەت چاوەکــەم
جەننەتولفیردەوســە جێگــەم، بــێ حیســابو بــێ کیتــاب
بێــرە تــۆ ڕەحمــی ئیلاهــی، بیخــەرە تــۆی دەروون
ســا بــە خــوا هەڵناگــرێ، قەلبــی حەزیــن، جــەورو عیتــاب
لام لــە بەدبەختــی منــە، عەهــدی ئەتــۆ، ناهێتــە جــێ
عەهــدی تــۆ، خــۆ وا نەبــوو، ســا بــۆ دڵــی پڕجــۆشو تــاب
ئــەو دڵــی غەمگیــنو غەمبــار، پــڕ لــە ئــازارو لــە ئێــش
ڕاوەســتاوم مــن بەســەر پــاوە، لــە دەر بــارەی وەهــاب
دەســتەو دۆعــا بێــی بــۆ ســەرینم، نیوســەعاتێ چاوەکــەم
دانیشــی نەختــێ لــە لای دڵ، لاکیــن بــێ جــەورو عیتــاب
بــا وەکــو هاتیــە ســەرینم، بێــژەو: مەیلــی چــی ئەکــەی
مــن ئەڵێــم دوو ســێوی ســینەت، تــۆ بڵــێ: هــا بــێ عــەزاب

*** *** ***